حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# جینۆسایدا گەلێ کورد

## بۆ پۆلا دەهێ ئامادەیی (زانستی و وێژەیی)
## و قۆناغا ئێکێ خواندنا پیشەیی و پەیمانگەهان


ئامادەکرن
ویسی صالح حمد امین
عمر علی شریف    عبید خدر فتح الله
پێداچوونا زانستی و هەڵسەنگاندن
د.یوسف معروف دزەیی
کرمانجیکرن
قیس صباح حمید    دلخاز خالد محێ
پێداچوونا زمانی - کرمانجی
محمد عبدالله أحمد



چاپا چارێ    ٢٧١٦ کوردی    ٢٠١٦ زایینی    ١٤٣٧ مشەختی

# ناڤەرۆك

# پێشەکی

ل دەسپێکا سەدێ بیستێ دەولەتا عیراقێ ژ لایێ ئینگلیزڤە هاتە دامەزراندن، پێك هاتنەکا سەیر و دوور ژ ئارەزووێن گەلێ کوردستانی بوو، لەورا ئەڤ قەبارێ نوی ژبۆ بجهـ ئینانا ئارمانجا خو بەردەوام ئاکنجیێن کوردستانێ تووشی دەربەدەریێ و مالوێران و تەیرانی کرینە. دەسهەلاتدارێن عیراقێ هەر دەسپێکێ ب هەمی شیواز و ئامرازان خو نەدایە پاش ژ گوهورینا پێکهاتا نەتەوەیی و کەلەتووری و کۆمەلاّیەتی و روشەنبیری و دیموگرافی و جوگرافییا دەڤەرێ ب رێکا بکارئینانا تاوانا راگواستنێ و عەرەبکرنێ و بکارئینانا هێز و سوپا و چەکێ کۆمەلّکوژی قەدەغەکرییێ نیف دەولەتی و زیندان کرن و بەرزەکرنا هاولاتییێن سیڤیلێن بێ تاوان و سوتاندنا رەز و باغ و گوند و باژێران و ژناف و برنا ژێرخانا ئابوورییا دەڤەرێ، بۆ هندێ دا خەلکێ مللەتی ملکەچ بکەن بۆ حەز و مەرەمێن خۆ. دوماهیك جار ل دوماهیا سالێن هەشتییێ ژ سەدێ بیستێ، تاوان لسەر دەمێ بەعسییان گەهشتە گوپیتکا درندایەتییێ بەرامبەری گەلێ کوردستانێ، کو ناڤدارترین ژ وان تاوانا ب ناڤێ (ئەنفال) ێ بوو ل بەر چاڤێ جڤاکێ نیف دەولەتی دژی گەلی کوردستانێ هاتە ئەنجام دان. ئەم دشێن ئەڤێ تاوانێ ب مەزنترین تاوانا سەردەمی بژمیرین کو دەرحەقێ مرۆڤایەتییێ هاتییە ئەنجام دان ل کوردستانێ.

مەرەم ژ بەرهەڤکرنا ئەڤی بابەتی، دانەنیاسینا ئەڤێ تاوانێ و رەش کوژیێ کو بەرامبەر مللەتێ کورد هاتی یە ئەنجام دان، بۆ هندێ کو نەڤیێن خۆ ئاگەهدار بکەین داژبیر نەکەن و بکەنە سەربور بۆ داهاتییێ خۆ، دا بنیاتێ جڤاکێ کوردستانا

نوی ل سەر دامەزرینین، دووربیت ژ گیانی رەگەز پەرستیێ توند و تیژ و ڕەوشتێ نەمرۆڤانە و دەرحەقێ وەلاتییێن کور دستانێ.

بابەتێ جینۆسایدا گەلێ کورد ژ شەش پشکا پێك هاتیە، لدویف زنجیرا مێژوویا ڕویدانا خۆ جهە کریە ژ دەسپێکا دەولەتا عیراقێ کو پێك هاتییە ژ عەرەب کرن و راگواستن، و ژ ناڤبرنا کوردێن فەیلی، کۆمەڵکوژا بارزانییان و بکارئینانا چەکێ کۆمەڵکوژ، ئەنفال و قوناغێن ژ ناف برنێ و کاریگەریا وێ ل سەر جڤاکێ کوردستانێ.

ل دەمێ ئامادەکرنا ئەڤی بابەتی پشکێن دیارکرییێن وەرزێ خواندنا ل بەرچاڤ هاتیە وەرگرتن، کو سنووردارە، چونکی بابەتەکێ تازەیە هەر تێبینیەك و سەرنج راکێش و رەخنەك دەربارەی بابەتی هەبن ئەم سوپاسی یا وان دکەین ئاگاهداری یا مە بکەن کو بشێین دداهاتیدا مفای ژێ وەربگرین. هیڤیدارین ئەم شیابین هەتا رادەکی خزمەتا وی گیانێ یێ تاوان کرییێن ئەوێ بوویە ئارمانجا مەرەمێن سیاسەتا دڕندانەیا دەسهەلاتدارێن عیراقێ. ل دوماهیێ سوپاسیا هەمی وان لایەن و کەسێن دلسۆز دکەین کو هاریکاریا مە کری ژ بۆ ئامادەکرنا ئەڤێ بابەتی ب تایبەتی دوەزارەتا کاروبارێن شەهیدان ئەنفالکریان وئەنستیوتا کوردی بۆ فیکتو مولوجی و بەرهنگاربوونا جینۆسایدێ و سەنتەرێ ئەنفال بۆ دویف چوونا ئەنفالکری و یێ سەروشوینێن کوردستانێ) ب ڕێنما و ژێدەران هاریکاریا مە کرین.

دەستەیا ئامادەکار

# بەشێ ئێکێ

## عەرەب کرن و ڕاگواستن

### دەسپێك :

هزرا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ، ژ هەدوو ویلایەتا بەسرە و بەغدا، قەوارەیەك بوو، ئینگلترا چێکربوو، ژ بۆ پاراستنا بەرژەوەندیێن ستراتیجییێن خۆ، لەورا گرێدانا ویلایەتا مویسل (باشوورێ کوردستانێ) ب دەولەتا نەتەوەییا عیراقێ ڤە تشتەکێ ئێکجارکی بوو د سیاسەتا بریتانیادا ژبۆ بەرچاڤ وەرگرتنا هوکارێ ئابووری و بەرژەوەندییێن بریتانیا.

ب بریارەکا کۆمەلا نەتەوەیان ل ١٩٢٥/١/١٦ ب فەرمی باشوورێ کوردستانێ (ویلایەتا مویسل) کرە پشکەك ژ لەشێ سیاسیێ نەتەوەیی یا عیراقێ بەلێ پشکەکا جودا، ژبەر وێ چەندێ ڕژێمن عیراقێ یێن ئێك لدویف ئێك، بەردەوام د بزاڤا دارشتنا پێك هاتا نەتەوەیی و جوگرافی و مێژوویی یێ ڤێ هەرێمێ بوون ب دارشتنەکا عەرەبی ژبۆ مەرەما نەهێلانا هەمی نیشانێن جودا دناڤبەرا عیراقا عەرەبی و کوردستانێ دا. ئەڤ کریارە ب رێکا سیاسەتا عەرەب کرن و ڕاگواستنا ئاکنجیا هاتییە ئەنجام دان.

### سنوورێ کوردستانێ

دیارکرنا سنوورێ باکوورێ رۆژئاڤا و رۆژهەلاتا ئەڤێ هەرێمێ، کارەکێ بساناهییە، چونکی رێکە دگەل سنوورێ نیڤ دەولەتی، ئیران تورکیا و سوریا رێك دکەڤیت، بەلێ ئەوێ ب زەحمەت باشوورێ رۆژئاڤا کو بەردەوام جهێ هەڤرکی و ململانێ یە دناڤبەرا کورد و حکومەتا عیراقی دا بوویە. زنجیرا گرگێن حەمرین

دکەڤیتە باشوور و باشووریٚ رۆژئاڤا، کو سنووریٚ دناڤبەرا هەریٚما کوردستانیٚ و پشکێن دیێن عیراقیٚ پێك دئینیت.

**ئامارا سالا ١٩٧٥ ئاکنجییێن کورد ب ڤی شێویٚ خواریٚ دهێنە پۆلینکرن:**

١. پاریٚزگەهێن دهۆك (کو پشکەك بوو ژ مویسل) - و سلێمانی - هەولێر کەرکووك.

٢. سەرجەم ناحیە و قەزاییێن پاریٚزگەها مویسلیٚ ژ بلی قەزا مویسل و حەزەر.

٣. قەزا خانەقین و کفری و مەندلی، ژبلی ناحیا (بەلەدرۆز) ل پاریٚزگەها دیالە.

٤. مەلبەندیٚ قەزا بەدرە ل پاریٚزگەها واست.

## عەرەب کرن و ڕاگواستن:

پشتی سالا (١٩٢٥) ویلایەتا مویسل ب نەخشیٚ سیاسی عیراقیٚ ڤە گرێدا. کورد ژ پتریا نەتەوەیی دبیتە کێمینە سەبارەت دەولەتا عیراقیٚ.

ژ ویٚ رۆژیٚ کورد وەکی کێم نەتەوە بەردەوام ل بن رەحمەتا شوفینی و نەتەوە پەرستیا رژێمیٚ و دەسهەلاتدارێن جودا دا بوون ل دویڤ دروشمیٚ: (گەلیٚ عیراقیٚ پشکەکە ژ نەتەوەیا عەرەبی و عیراق ژی پشکەکە ژ نیشتیمانیٚ عەرەبی). گومان دهندێدا نەبوو کو کورد پشکەك بوویە ژ گەلیٚ عیراقیٚ. بەلیٚ چ جارا پشکەك نەبوویە ژ نەتەوەییٚ عەرەبی. جوگرافیا هەریٚما کوردستانیٚ کو نوکە پشکەکە ژ ئاخا عیراقیٚ و چ جارا پشکەك نەبوو ژ نیشتیمانیٚ عەرەبی. ب گرێدانا باشووریٚ کوردستانیٚ (ویلایەتا مویسل) ب عیراقیٚ ڤە کو هەریٚما جوگرافی یا جودا دبیتە پشکەك ژ لەشیٚ سیاسی یا دەولەتا نەتەوەیی یا (قومي) عیراقیٚ. بەردەوام رژێمیٚ نەتەوە پەرستییێن عیراقیٚ سەبارەت ئێکبوونا یا ئاخا عیراقیٚ و ئاسایشیٚ نەتەوەییٚ و ئابووری کورد کرینە مەترسی بۆ پارچە پارچەکرنیٚ، لەورا رژێمێن

عیراقێ پاشایەتی و کەڤنە پەرێسا هەتا کوماریێ و چەپ و پێشکەفتن خوازان، دبزاڤا دارشتنا شێوێ نەتەوەیی و دیموگرافی و جوگرافیا هەرێما کوردستانێ بووینە دارشتەکا عەرەبانە نەخشە بۆ دارێژتیە، ژبۆ نەهێلانا جیاوازیا هەوریشالێ دناڤبەرا کوردستانێ و پشکێن دی یێن ژ عیراقی ژبەر ڤان ئەگەرێن خوارێ:

١. کوردستان ناوچەکا دەولەمەندە ب سامانێ نەفت و کانزایان.

٢. هەرێمەکا گرنگە ژبۆ دابینکرنا ئاسایشا خوارنێ.

٣. ئاخەکا ب بیتە و ژێدەرێن ئاڤێ گەلەك هەنە.

٤. جهێ وێ دکەڤیتە دناڤبەرا سنۆرێ سێگوشا هەرسێ دەولەتێن (تورکیا و ئیران و سوریا).

سیاسەتا عەرەبی کرن و ڕاگواستنێ ب یا بەرنامەکری بوو، ئەم دشێین مێژوویا ئەڤێ ولاتی ب مێژوویا ترسنال گوهۆڕینا هەڤکێشان بۆ مفایێ پتریا عەرەبی ل قەلەم بدەین. ب گوهاستنا ئاکنجیێن کوردا و ئاکنجیکرنا عەرەبا ل جهێ وان، ب تایبەتی ل ڤان سێ دەڤەران:-

(جەزیرە، کەرکووك، ڕۆژهەلاتا بەغدا (هەرێما کوردێن فەیلی)).




نەخشێ ژمارە (١) عەرەب کرن و ڕاگواستنا ئاکنجییێن کورد ژ هەرێما کوردستانێ *

---

* ژ نەخشێت سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتلەسا هەرێما کوردستانا عیراقێ.

ئەڤ پروسەیە هەڤدەم بوو دگەل کریار ێن سەربازی، کو هێز و سوپایێن حکومەتا عیراقێ ل دەڤەرێن کورد لێ ئاکنجی ئەنجام ددا، ب وێرانکرن و هەرفاندن و ڕاگواستنا ئاکنجییێن گوندێن کوردان و کومکرنا وان ل کۆمەلگەهێن ب زۆری.
سەبارەت سیاسەتا یەکخستن و ئێك گرتن و ئەزموونا دەولەتا عیراقی دا، ب تایبەتی ل دویڤ دیتنا ڕژێما بەعسی، ئارمانجا دویرکەفتنێ بوو ژ هزرا (عیراقی بوون) ێ و نێزیکبوونە ژ هزرا (عەرەب بوونێ).

**عەرەب بوون:** پێکهاتیە ژ پێناسەرکرنا سەرجەم دام و دەزگەهێن دەولەتێ و سیستەم و فەلسەفە حوکمرانییێ دچارچوڤێ هزرا نەتەوە پەرێسا عەرەبیدا.

ب ڕامانەکا دی ئەزموونا عیراقێ بۆ گەشەپێدان و دروستکرن و چەسپاندن و بیگری بوون ب عەرەباتییێ کارکرییە بۆ تەپەسەرکرنا نەتەوەیێن دی.

عیراقی بوون ل دویڤ بۆچوونا بەعسیا تنێ ئێك ڕامان هەیە ئەوژی عەرەببوونە، زێدەباری هندێ کو تایبەتمەندیا حوکمێ بەعسی پەنابدەنە بۆ توند و تیژیێ، وەکو ڕێکە بۆ چارەسەریا دۆزا حزە نەتەوەیی، ب سەر گەلێن عیراقێ ب گشتی و عەرەبێن شیعە یێن باشووری و کوردێن باکور ب تایبەتی رەنگك ڤەدایە.

ئەگەر سەرنجێ بدەینە سەرکریارا سیاسەتا عەرەبکرنێ، وەکو ڕێکەك بۆ ژێبرنا ناما نەتەوێ کورد، دێ وێ بینین ب دوو ئاراستەیێن هزری کارکرییە، جۆرێ ئێکێ پێکهاتیە ژ گوهۆڕینا ناڤێن جهێن کوردی و دەرئێخستنا کوردان ژ جهێ باب و باپیران ئاکنجیکرنا عەرەبان ل جهێ وان یان کارکرن ژبۆ گوهوڕین تێك و شیلاندنا مێژوویا نەتەوێ و کو شینوارێن دیرینێن وان کوردبوونا وی

دەڤەرێ دسەلمینن بۆ نموونە ڕژێما بەعسی کەڤتە بزاڤا تێکدانا کەلها کەرکووکێ، رۆژا ١٩٩٩/١٠/٥ دسمینارەکا زانکۆیا تکریت ب ئامادەبوونا کەسێ دووێ یێ رژێما بەعسی (عزت الدوري) بەرامبەر کومەکا ئەکادیمی و دبلوماسیێن عەرەب و بیانی، دگۆتارەکێدا راگەهاند (پێدڤییە ب هویری ل پەرتووکین مێژوویێ بنێرین بۆ هندێ دا وان راستیێن مێژوویی ببینین کو سەلاحەدینی ئەیوبی پالەوانەکێ عەرەبە نە کوردە) بێ گومان سەرجەمێ ئەڤان کو رو سیمیناران دچنە دچارچۆڤێ قوتابخانا بابەتێ (المدرسة الموضوعية). بۆ دیارکرنا ناسناما نەتەوێ عەرەب. لێ سالێن نۆتێ ژ سەدێ بۆری (بیت) حکومەتا عیراقێ رێکەکا دی گرتە بەر بۆ گوهورینا ناسناما نەتەوێ کورد. ئەوژی ب دابەشکرنا فورمێن ڕاستڤەکرنا بارێ نەتەوایەتی (أستمارة تصحيح القومية). و هەمان دەم دا حەزکر رۆلەکێ یاسایی و ئارەزوو مەندانە ببینیت ب گوهورینا ناسناما نەتەوەیی، کو بێ گومان گڤاشتنەکا ئێکجار زۆر هەبوویە بۆ پرکرنا وان فۆرما. سەر پیچی کرن ژ پرکرنا ڤێ فۆرمێ، پێکهاتی بوو ب زیندانکرنێ، د دویڤدا ڕاگواستن بۆ دەڤەرێن ژێر دەسهەلاتا حکومەتا هەرێما کوردستانێ.

## قۆناغێن سیاسەتا عەرەبکرنێ و ڕاگواستنا کوردان:

قۆناغێن سیاسەتا عەرەبکرن و ڕاگواستنا کوردان، هەر ل دەستپێکا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ دەستپێکریە، ب ڤی رەنگی دشێین چەند قۆناغێن جودا دەست نیشان بکەین، ژ مێژوویا دەسپێکرنا سیاسەتێ، کو ئەڤەنە:

١. قۆناغا گرێدانا ویلایەتا مویسل ب عیراقێ ڤە هەتا روخاندنا پاشایەتیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٢٥ - ١٩٥٨).

٢. قۆناغا دامەزراندنا سیستەمێ کوماری هەتا ڕۆخاندنا حکومەتا عەبدولکەریم قاسم ل (١٩٥٨ - ١٩٦٣).

٣. قۆناغا حوکمێ پاسەوانێت نەتەوەییێن بەعسی هەتا کودەتایا جارا دووێ یا بەعسیان (١٩٦٣ - ١٩٦٨).

٤. قۆناغا چەسپاندنا دەسهەلاتا حیزبا بەعسی هەتا هەلبوونا شەڕێ خوینا وی (ئیران - عیراق)، دناڤبەرا سالێن (١٩٦٨ - ١٩٨٠).

٥. قۆناغا پیادەکرنا جینۆسایدێ دژی کوردان ژ لایێ بەعسیانڤە تاکو ڕاپەڕینا جەماوەریا کوردستانێ ل سالا (١٩٩١)، دناڤبەرا سالێن (١٩٨٠ - ١٩٩١).

٦. قۆناغا پشتی سەرهلدانێ دناڤبەرا سالێن (١٩٩١ - ٢٠٠٠) کو پشکەکا ئاخا کوردستانێ ل بن دەستهەلاتا رژێما بەعسی مابوو.

٧. قۆناغا پشتی رۆخاندنا رژێما بەعسی ل دەڤەرێن ڤەقەتیای ل سالا (٢٠٠٣ هەتا نهۆ) کو کێشەیەکا زۆر ل سەرە. دناڤبەرا کورد و دەستهەلاتا ناڤەندی ل بەغدا ژ لایەکی و ئاکنجییێن کورد و گرۆپێن تیرورستان ژ لایەکێ دیڤە، کو گەف ل گیان و سامانێ وەلاتییێن کوردێن ئاکنجی ل دەڤەرێن (سەعدیە و جەلەولا و قەرەتەپە و شنگال و رۆژئاڤا کەرکووك دکر ژبۆ زۆری دەرئێخستنا وان ژ جهێ وان بۆ دەڤەرێن ل بن دەستهەلاتا حکومەتا هەرێما کوردستانێ.

## قۆناغا ئێكێ: (١٩٢٥ - ١٩٥٨)

ئەڤ قۆناغە سەر دەمێ پاشایەتیێ هەمیێ ڤەدگریت، ب تایبەتی ل وی دەمی یێ کو ویلایەتا مویسل ب عیراقێ ڤە هاتییە گرێدان ل (١٦ای کانینا دووێ ١٩٢٥) ب سەردەمەکێ نە ئارام دهێتە دانان، کو سیستەمێ حکومرانیێ و بارێ ئاساییشا گشتی و کارگێری ل عیراقێ، گەلەك یا سەرەتایی و بێ پلان بوو. کریارا عەرەب کرن و راگواستن ئاگنجیبیا وەك پێدڤیەکا نەتەوە پەرستا رژێمێن عیراقێ بێ بەرنامەرێژی و هێدی بوو. ژ لایێ جوگرافی ژی ڤە رووبەرەکێ کێم ڤەگرتیە.

ل سالا ١٩٣٢ و چارچوڤێ سیلسەتا نەراستەوخۆ یا عەرەب کرنێ بریارا ژمارە (٥٠) یا تایبەت ب رێکخستنا مافێ زەوی زار هاتە دەرئێخستن. کو ل سالا ١٩٣٨ هاتییە گوهورین بۆ یاسایا ژمارە (٢٩). دڤێ یاسایێدا مافێ مولکداریێ ب فەرمی هاتە دان بۆ وان هۆز و بنەمالێن ئاکنجییێ ل وان زەڤیان ئەوێن ل سەر دژیان.ل دویف ڤێ یاسایێ مولکداری و تابوکرنا زەڤیێن چاندنێ یێن کوردا ڤەگرت، ب تایبەتی دەڤەرێن ژێری یا رۆژئاڤا یا کەرکووکێ و دەشتا قەراج و کەندێناوە و گوێرە و زممار. لدویف راپورتەکا وەزارەتا کاروبارێن کۆمەلایەتی یا عیراقێ ئەوا ل رۆژا (١١/٥/١٩٥٨)ێ دەرچووی.

دیاربوو کو دناڤبەرا سالێن (١٩٤٧ - ١٩٥٧)، لیوایا کەرکووکێ (٢٨٠٠٠) کەس و لیوایا مویسلێ (١٧٠٠٠) کەس بۆ هاتنە رەوانەکرن، کو بارا پتر وان ژ لیوایا عەمارە هاتبوون. پرۆژێ حەوێجە کو ل سالا (١٩٦٣)ێ دەستپێکر و ١٩٤٠ ێ تەمام بوو. ب تەمام بوونا ڤی پرۆژەی چەندێن هزار مالێن عەرەبێن کوچەر ئینانە وێ دەڤەرێ.

ب پاناتیا وان زەڤیێن پرۆژەی مفا ژێ هاتە وەرگرتن بۆ ئاکنجی بوونێ. هژمارا وان یێن ل ڤێ دەڤەرێ هاتینە ئاکنجی کرن، ل دویڤ ئامارا (١٩٥٧) گەهشتە (٢٧٧٠٥) کەسان ل (٢٢٨) گوندێن نوی. هەر ب وی شێوەی سالا ١٩٥١ ل پرۆژێ مەخمور ل (٥٠ - ١٠٠ دونم) زەڤی ل سەر (٧٠) خێزانێن عەرەبی هاتە بەلافکرن. ئاکنجی کرنا هۆز و عەشیرەتێن گوچەرێن عەرەب ل دەڤەرێن کوردان ب زۆری ئەو دەڤەر ڤەگرتیە کو سنوورێن گەهشتنە ئێك دئینن دناڤبەرا کوردستان و ویلایەتا بەغدا، بەرەڤ کویراتیا ئاخا کوردستانێ. هەر ژ مەندەلی و خانەقین بۆ دووز و ژێرییا کەرکووکێ و ژێرییا مەخمورێ هەتا دگەهیتە شنگالێ. بێ گومان ئاکنجی کرنا هۆز و عەشیرەتێن عەرەب ل دەڤەرێن کوردان دا بوارێ دیموگرافی یا ئاکنجییان ژ لایێ پێکهاتێ نەتەوەیی ب شێوەکێ بەرچاڤ گوهورپە، ژبلی ڤێ چەندێ ژبەر دامەزراندنا پیشەسازییا گازێ یا کومپانیا نەفتا عیراقێ، ل باژێرێ کەرکووکێ چەندین گوهۆڕینێن دیموگرافی و نەتەوەیی ب سەر ڤێ دەڤەرێ هاتە کرن. چونکی وان کومپانیا هژمارەکا زۆرا کرێکارێن عەرەب ژ پارێزگەهێن دی ئینانە پارێزگەها کەرکووکێ و ئاکنجی کرن. چەندین تاخێن نوی ل باژێرێ کەرکووکێ دروست کرن وەك تاخێ (عەرەفە) (کەرکووکا نوی).

## قۆناغا دووێ:(١٩٥٨ - ١٩٦٣)

ئەڤ قۆناغە ل وی دەمی دەستپێکر، دەمێ رژێما پاشایەتی ل ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ ژناف چوو، بۆ جارا ئێکێ سیستەمێ کۆماری ل عیراقێ هاتە راگەهاندن، هەرچەندە ئەڤێ شورەشێ ل دەستپێکێ بارا پتریا خەلکێ عیراقێ دگەلدا بوون هولویستێ

عەبدولکەریم قاسمی بەرامبەری کوردایێ ئەرێنی بوو، بانگەوازیا سەرکردێن کوردا ئەوێن دوور ئێخستی کر بۆ عیراقێ ب تایبەتی بارزانی. (ل ٦/١٠/١٩٥٨)، مستەفا بارزانی ژ لایێ عەبدولکەریم قاسمی ب گەرمی پیشوازی لێ هاتە کرن، ل بەرامبەر وی دا مستەفا بارزانی ب تمامی شیانێن خ و پارتا خو بۆ شۆرەشا ١٤ تیرمەهێ دەربڕی. ب تایبەتی کو دستورێ بەروەخت یێ کۆمارا عیراقێ ل ماددێ سێیێدا ئاماژە ب وێ دکەت کورد و عەرەب ل وی نیشتیمانێ کو ناڤێ وی عیراق هەڤ پشکن. لێ دروژێن پاشتردا هاتە دیارکرن هەلویستێ نەگورێ رژێما سیاسی ل عیراقێ بەرامبەری کێشا کوردی هەر ئەو سیاسەت بوو ئەوا کو بەرێ ب رێکا عەرەباکرن و راگواستنا ئاکنجیێن کوردان د هاتە پەیرەوکرن. پشتی سەرکەفتنا شۆرەشێ ب دەمەکێ کورت (زەعیم نازم تەبەقچەلی) وەك سەرکردێ سەرپەرشتیا هێزا سوپای عیراقێ ل باکووری دکر. دڤی ماویدا رولەکێ بەرچاف د دیت ژبۆ عەرەب کرنا دەڤەرێن کوردان، ب تایبەتی ل باژێرێ کەرکووکێ. سەبارەت ب ماددێ سێیێ یێ دستورێ بەروەختێ عیراقێ

دان پێدانێ ب مافێ کوردان دکەت، ب تەمامی پشت گوهـ هاڤێتن، ئەڤە زێدەباری وێ چەندێ کو هەر برگا دووێ ژوی دستوری ب تەمامی دژی ماددێ سێیێیە، کو دبێژیت (عیراق پارچەکە ژ میللەتێ عەرەبی). ژ درێژە پێدانا سیاسەتا ب عەرەبکرنا دەڤەرێت کوردی، دەسهەلاتدارێن عیراقێ دەست ب بەلاڤکرنا زەڤیا ل سەر عەشیرەتێت کوچەرێت عەرەبی کر، ب تایبەتی ئاکنجیکرنا هژمارەکا زۆر ژ هۆزێت کوچەرێت عەرەب ل دەڤەرا جەزیرێ.

ل سالا (١٩٦٠)ێ ناحیا رەبیعە هاتە دروست کرن و (١٦) ئاڤاهی بۆ عەرەبان هاتنە ڤەکرن. ل تەلەعفەر (١٢) و ل شەنگال (١٥)، ل ناحیە عەتبە (٨) ئاڤاهی بۆ عەرەبان هاتنە ڤەکرن. جهێ ئاماژەپێدانێیە هەر دڤێ قۆنا غێدا چەند گوهورینێت کارگێری ل سەر چەند دەڤەرێن پتریا وان کورد هاتنە کرن، کو ب مەرەما شێلیکرنا دیموگرافیا باژێرێت کوردی بوو.

ل سالا (١٩٦٢) قەزا حەویجە هاتە پێك ئینان، ژ رویێ هەڤکێشا دیموگرافیێ (١٧٪) ژ ئاکنجییێن پارێزگەها کەرکووکێ پێك دئینیت، کو پتریا ئاکنجییێن وێ قەزایێ هۆزێت عەرەب بوون. ئەوێن بەری هنگێ ل وێ دەڤەرێ هاتینە ئاکنجی کرن.

## قۆناغا سێیێ: ( ١٩٦٣ - ١٩٦٨)

ئەڤ قۆناغە پشتی کودەتا پاسەوانێت نەتەوەیی ب سەرروکاتیا (عەبدولسەلام عارف) ل (٨)ێ شواتا (١٩٦٣) ل دژی عەبدولکەریم قاسم هاتە ئەنجامدان. ئەڤێ دەسهەلاتێ هەر ژ دەسپێکێ دەست ب سەرداگرتنا دەسهەلاتێ کر، چ پرۆژێت ئەرینێ نەبوون بۆ چارەسەرکرنا ئاشتیانە بۆ کێشا کوردی ل عیراقێ. دڤی سەردەمیدا عەبدولسەلام محەمەد عارف کەفتە (پەیرەوکرنا) سیاسەتا ئێکەتیا عەرەبی (الوحدة العربية) کو هێڤێنێ بیروبوچونێت رەگەز پەرێسا نەتەوەیی بوو، ب پێك ئینانا پارتەکا نوی هەمی عیراقێ ڤەدگریت ب ناڤێ ئێکەتیا سوشیالستا عەرەبی (الاتحاد العربي الاشتراكي). یا ژ هەمیێ سەیر تر داخوازا (پارتی دیموکراتی کوردستان) هاتە کرن کو دچارچوڤێ ڤێ پارتا نویدا خۆ ب بگونجینیت.

د ڤێ قوناغێدا پرسەکا سیاسی یا زۆر گرنگ هاتە گۆڕێ، کو پەیوەندی ب پروسا ب عەرەبکرنێ ڤەبوو، ئەوژی کومارا ئێکگرتی یا عەرەبی بوو (الجمهورية العربية المتحدة)، هەرسێ وولاتێن مسر و سوریا و عیراق ب خۆڤە گرت. دەسهەلاتدارێن عیراقێ ب وی رەنگی سەحدکرە کوردا وەك ئاستەنگەکا سەرەکی بەرامبەر ڤێ ئێکگرتنێ. کوردان ژی ژلایێ خوڤە ئەڤ پرۆژە ب مەترسیەکا مەزن بۆ سەر ناسناما نەتەوەیی یا خۆ دزانی، چونکی ل دەمێ دروست کرنا ڤێ دەولەتێ رەگەزنامە (الجنسيات) ل هەرسێ وولاتا دهاتە گوهورین، بۆ رەگەزناما عەرەبی. بۆ نموونە هاوولاتیێ عیراقێ، کو هەلگرێ رەگەز ناما عیراقییە، وی دەمی دڤیا ب گوهوریت بۆ رەگەزناما عەرەبی نە ژ دویر نە ژۆ نیزیك چ تایبەتمەندیا گەلێ کورد بەرچاڤ نەهاتە وەرگرتن، چ ژلایێ جوداهیا نەتەوەیی یان جوگرافیڤە ل گولانا (١٩٦٣) دان و ستاندن دناڤبەرا کوردان و حکومەتا عیراقێ گەهشتە (ڕێکەکا گرتی).

هەر ل خزیرانا وێ سالێدا جکومەتێ دەست ب هێرشا سەربازی کر بۆ باژێر و گوندێن کوردستانێ. بۆ نموونە ل باژێرێ سلێمانیێ قەسەبخانەیەك ئەنجامدا کو (٢٨٠) دوو سەد و هەشتێ کەسێن مەدەنی بێ گەنهـ گولله بارانکرن. ل (٩)ێ تیرمەها (١٩٦٣) ل باژێرێ کویێ (٢٠) بیست کەس، پشتی هاتینە گرێدان ب ستوینێت سەر جادان گولله بارانکرن. حکومەت ل وی سەردەمی کەفتنە پەیرەوکرنا جینۆسایدکرنا گەلێ کورد، ب دەرێخستن و راگواستنا گوندێن کوردی و ئاکنجیرکنا هژمارەکا زۆرا هۆزێن کوچەرێن عەرەب ل جهێ وان، ب تایبەتی ل

پارێزگەها کەرکووك و هەولێرێ. بۆ نموونە ب تنێ ل پارێزگەها هەولێرێ (٢٧) گوند ب زۆری هاتنە چولکرن، ب بەهانا پاراستنا بیرێن گازێ یێن دەڤەرێ و ئاکنجیکرنا عەرەبان ل جهێ وان و پرچەك کرنا وان و هاریکاریکرنا وان یا دارایی.

**ڕژێما عیراقێ دەست پەیرەوکرنا سیاسەتا ب عەرەبکرن و ڕاگواستنێ کر ب:**

١. وێرانکرنا وان گوندێن باژێرێ کەرکووکێ بوون ، ب تایبەتی ئەوێن نێزیك بیرێن گازی، کو (١٣) گوندبوون، وەك (شۆنەگولی، یاروەلی، پەنجا عەلی، وەلی پاشا، قزل قایە، چیمەنی گەورە و چیمەنی بچوك، جەوەڵ بۆر، هەنجیرە، قوتان، قوشقانە، شۆراو و یا جوان).

٢. ڕاگواستنا هەمی کوردێن ناحیا دوبز، پشتی هنگی ناڤێ وی گوهوڕی بۆ (دبس) و ئینانا عەشیرەتێن کو چەرێن (حدیدی) و ئاکنجیکرنا وان، ل گوندێن (قەرەدەرە، عەمشە، قەلا عەرەبەت، کتکە .... هتد).

٣. دەرکرنا کرێکارێن کورد ژ کۆمپانیا نەفتا کەرکوکێ.

٤. گوهوڕینا ناڤێن ناڤەندێن خاندنێ و جهێن گشتی ژ ناڤێن کوردی بۆ ناڤێن عەرەبی.

دەڤەرا شنگال ژی ژ ڤان تاوانا بێ بار نەبوو، ل سالا ١٩٦٤ ڕوبەڕی هێرشەکا دڕندانە یا دژوار یا عەرەب کرن و دەرئێخستنێ بوو. بۆ نموونە (١٣٢) گوندێن دەڤەرێ ب بەرڤێ هێرشا ڤەگوهاستنێ کەفتن و ئاکنجیێن وی ل (١١) ئوردگایێن ب زۆری کۆمکرن، کو ب ناڤێن عەرەبی هاتنە ناڤ کرن، ژ وان (الاندلس، القحطانیة، العروبة، القادسیة، الولید، العدنانیة ... هتد).

## قۆناغا چواری: (١٩٦٨ - ١٩٨٠)

ئەڤ قوناغە ب توندترین و شۆڤێنیترین قۆناغا بزاڤا نەتەوا پەرێستا عەرەبی دانا. هزرا دەسهەلاتێن عیراقێ و ئەو بوو کو کێشا کوردی دێ ب بنبنکرنا کوردا چارەسەر بیت، لەورا سیاسەتا عەرەبکرنێ و ڕاگواستنێ ل مێژوویا سیاسیا عیراقێ دچیتە قۆناغا جودادا هەتا ئەندازەیەکا زۆر شێوازێن بەعسی ب جورێن ڕەفتارکرنێ دگەل گەلێن بن دەستێ وان دا، لدویف تەکنیکێ و شێوازێن نازییان دچوو. بۆ نموونە دماددێ حەفتێ دا، ل کونگرێ ئێکێ یێ دامەزراندنا حزبا بەعسی هاتیە پەسەندکرن، (کوردستان بەشەکە ژ نیشتیمانێ عەرەبی). ئەڤ قۆناغا حزبا بەعسی دڕندانەتر ژ قۆناغێن بەرێ دهێتە دانان، ژ گوشتن و سوتاندن، و وێران کرنا گوندێن کوردستانێ، بۆ نموونە ل ١٩/تەباخ/١٩٦٩) هێرشا سوپایێ عیراقێ سەر هەردوو گوندێن (دەکا) و (خورست)، کو دکەڤنە باکورێ ڕۆژهەلاتا باژێرێ مویسل ل دەڤەرا ئاکرێ، بوو ئەگەرێ سوتاندنا هەردوو گوندان و ئاگر بەردا (٦٧) ژن و زارۆك و پیرا، د شکەفتەکێدا ل نێزیکی گوندێ وان خو ڤەشارتبوو ل ١٦/٩/١٩٦٩.

هێرشا بۆ سەر کوندێ (صوریا) ل سێگوشا سنوورێ (عیراقی - تورکی - سوریا)، (٦٠) کەس ژ ئاکنجیێن وێ یێن سڤیل هاتنە گولله بارانکرن.



گولله بارانکرنا (٦٠) کەسان ژ ئالییێ گوندیێ (صوریا)

هەر چەندە هەیڤا ئادارێ سالا (١٩٧٠) رێکەفتناما ئادارێ دناڤبەرا بزاڤا کوردی و حکومەتا عیراقێ هاتە ئیمزاکرن کو دان پێدان بوو ب مافێ ئوتۆنۆمی بۆ گەلێ کوردا ل هەرێما کوردستانێ. بەلێ ژبەر ڕاگەهاندنا یاسایا ئوتۆنۆمی ژمارە (٣) ١٩٧٤، حکومەتێ بلەز دەست بجهـ ئینانا سیاسەتا عەرەبکرن و راگواستنا ئاکنجییێن دەڤەرێن کەرکووك، خانەقین، ژمار، شنگال، شێخان کر، ل سالا (١٩٧١ - ١٩٧٢) پتر ژ (٤٠٠٠٠) هزار کوردێن فەیلی ناسناما وەلاتیبوونێ یا عیراقی ژێ هاتە ستاندن و رەوانەی سنوورێن ئیرانێ کرن ئەڤ ژمارا کوردێن دەرئێخستی هەتا دوماهی یا (١٩٨٠) گەهشتە نزیکی (٢١٥٠٠٠) دووسەد و پازدە هزار کەس. لدویڤ ئامارێن خاچا سۆرا تیڤ دەولەتی دبنە نێزیکی (٤٠٠٠٠٠) چار سەد هزار وەلاتی ل سالا (١٩٧٣)

هەوا گرتن و ڕاهێلانا کوردێن ئێزدی ل دەڤەرا شنگال دەستپێکر، ژبۆ هندێ کو وان نەچار بکەن وارێ خۆ چول بکەن و بەرەف دەڤەرێن دی بێن کورد لێ ئاکنجی مشەخت بن. و بەردەوامبوون ل سەر ڤێ سیاسەتێ دەڤەرێن ئاکرێ و شێخان ژی ڤەگرتن. هەروەسا حکومەتا عیراقی ب وێ چەندێ نەراوستیایە ل ریکەفتی (١٩٧٤/٤/٢٤) هێرشەکا ئاسمانی یا درندانە کرە سەر باژێرێ قەلادزێ ١٦٣ سەد و شێست و سێ کەسا گیانێ خۆ ژ دەستدا و (٢٥٠) دوو سەد و پێنجی هاولاتی بریندار بوون، کو ژمارەکا گەلەك ژ وان خویندکارێن زانکۆیا سلێمانییێ تێدا بوون. و زانکۆیا ژی ب تەمامی کاڤل وێران کر. هەر ل ڤی دەمیدا ل سنوورێ باژێرێ کەرکووکێ چەندین تاخێن نوی بۆ ئاکنجیکرنا خێزانێن عەرەبێن زڤری دروستکرن. ل دەمێ چەند سالادا (١٩) نوزدە تاخێن عەرەب لێ ئاکنجی دروست کرن. هەژی گوتنێ یە هەر چارچوڤێ عەرەب کرنا دەڤەرێن کوردی. بەعسیا دەست ب هەوەکا بەرفرەهـ یا ناف گوهورینا باژێر و باژێرکێن کوردا کر بۆ نموونە (شارەبان: مقدادیة، قرەهەنجیرە: الربیع، سەرگەران: القدس ... هتد.



دەرئێخستنا کوردا ژ وارێ باب و باپیرا

پشتی ڕێکەفتناما جەزائیر و شکەستنا شۆرشا ئەیلولێ، دەستێ حکومەتا عیراقی یێ ڤەکری بوو، بۆ پتر بجهـ ئینانا سیاسەتا عەرەبی کرن و راگواستنا کوردان، بەلێ ڤێ جارێ لدویف نەخشەیەکێ پلان بۆ هاتبوو دارێژتن و هاتە ئەنجامدان، نە بتنێ وان دەڤەرێن فرەنەتەوە، بەلکێ ڤێ جارێ ژی دەڤەرێن کورد ئاکنجی ڤەگرتن، ڕاگواستن بۆ هندەك جهێن دیارکری، کو بەعسیا ب ناڤ کربوون (کوندی هەڤچەرخ)، بەلێ ب راستی ئوردگاێن ب زۆری بوون. و ژبلی وان ژمارێن مەزنێن کورد، کو بۆ دەڤەرێن باشوورێ عیراقێ هاتینە راگواستن ب تایبەتی هەردوو باژێرێن (ناصرية و ديوانية) سالا ١٩٧٥ پتر ژ (٢٠٠ هزار) کورد ل کوردستانێ بەرەڤ دەڤەرێن باشوورێ عیراقێ ڕاگواستن ... ل هەیڤا یازدێ ١٩٧٥ کۆمەلا گەلێن هێرش لێکری ل ئەلمانیا - گویتنگن، دگەل کۆمەلا مافێن مرۆڤی ل هولەندا، ڕاگەهاند ژمارا راگواستنا گەهشتە (٢٠٠٠٠٠) هزار کەسا و سەد و شازدە گوند هاتنە وێرانکرن.

(٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هزار کوردێن ئێزدی ژ شنگالێ هاتنه راگواستن. ئەڤ هەوا راگواستنێ دێ بەردەوام بیت، ب جۆرەکی هەتا دەستپێکا سالا ١٩٧٩ ژمارا کوردێن راگواستی گەهشته (٧٠٠٠٠٠) هزار کەسا، کو ژ (١٢٢٢) گوند بەرڤی پێلێ کەفتن.

## شێوازێن ڕاگواستنا کورد پشتی ڕێکەفتناما جەزائیر ب ڤی شێوەی بوو:

١. ڕاگواستنا ئاکنجیێن وان دەڤەران ب جهەکێ ستراتیجی یێ بەرەڤانیکرنا عیراقێ دهاته دان.

٢. ڕاگواستنا دەڤەرێن نەفتی.

٣. ڕاگواستنا دەڤەرێن سنووری.

### ئێك: ڕاگواستنا ئاکنجیێن دەڤەرێن ستراتیجی یێن بەرەڤانیکرنا عیراقێ.

ئەو دەڤەر و ڕێوڕیبارن کو سوپایێ دەولەتا عیراقێ د هێرشا سەربازی دا بۆ گرتنا ئارمانجەکا ستراتیجی گرتە بەر، وەکو گوندێن قەزایێن خانەقین و مەندەلی پارێزگەها دیالە، (قەزا بەدرە ل واست) قەزا شێخان و تلکێف و تلەعفەر و شنگال پارێزگەها مویسل و پشکەك ژ قەزایێن زاخۆ و سێمێل ل پارێزگەها دهوکێ و پشکەك ژ قەزا دوز ل پارێزگەها کەرکووکێ.

### دوو: ڕاگواستنا دەڤەرێن نەفتی.

ئاشکەرایەکو نەفت مادەکێ ستراتیجییە گرنگیەکا جیوپولەتیکی هەیە د ئابوورێ دەولەتاندا و کوردستانێ ژی گرنتیا هەبوونا بڕەیی زۆرا نەفتێ مسوگەرکرین

لەورا هندێ هەوا عەرەبکرنێ و راگواستنا ب زۆری ئاکنجییێن ڤان دەڤەران ڤەگرت کو ب نەفتێ دەولەمەندن ئەو دەڤەر ژی ئەڤەنە:

١. ناڤەندا قەزا کەرکووك و قەزا دوبز ل پارێزگەها کەرکووکێ.

٢. قەزا کۆیە ل پارێزگەها هەولێرێ.

## سێ: راگەواستنا دەڤەرێن سنووری:

لدویف رێکەفتناما جەزائیر سالا (١٩٧٥)، دەرفەتەکا باش بوو بۆ دەسهلاتدارێن بەعسی، دانەخش و پلانێن خۆ ل کوردستانێ بجهـ بینن، لەورا بلەز کەفتە راگواستنا ئاکنجییێن دەڤەرێن سنوورێن ( عیراق - ئیران) و (عیراق - تورکیا) و (عیراق - سوریا)، ب کویراتیا (١٠ - ٢٠ کم) ب ناڤێ پشتینا ئەمنی ڤە بو ئوردگاییێن ب زۆری، دناڤبەرا سالێن (١٩٧٥ - ١٩٧٨) دا ب دەهان هزارا خێزانێن کورد ل ئوردیگایان کۆمکرن و هەمی گوند و گوندییێن ل سەر سنووری دگەل ئاخێ راستڤەکرن. ئەو دەڤەر ژی ئەڤەبوون:-

١. قەزاییێن چۆمان، رەواندۆز، زێبار (مێرگەسوور) ل پاربزگەها هەولێر.

٢. هەردوو قەزا ئامێدیێ و زاخۆ ل پارێزگەها دهوکێ.

٣. قەزاییێن قەلادزێ، رانیا، شارباژێر، شارەزوو، و هەمی گوندێن سنووری دناڤبەرا (عیراق - و ئیرانێ) ل پارێزگەها سلێمانیێ.

هەر ب چارچوڤێ سیاسەتا عەرەب کرنێ، حکومەتا بەعسی ناڤێ پارێزگەها کەرکووکێ گوهورِی بۆ پارێزگەها (تأمیم)، و دووبارە نەخشێ کارگێری یێ پارێزگەهێ دارشتەڤە. لدویف نڤیسارا سەروکاتیا کۆماری عیراقێ ژمارە (٤١) ل

١٩٧٦/١/٢٩، هەر چار قەزايێن (چەمچەمال، كفرى، توزخورماتو، كەلار). ل پارێزگەها كەركووكێ دامالين و ب پارێزگەهێن (سلێمانيێ - دياله - سەلاحەدين) ڤە گرێدان. ئارمانج ژێ كێمكرنا رێژا كوردا بوو پارێزگەها كەركووكێ.

## قۆناغا پێنجێ: (١٩٨٠ – ١٩٩١)

گەلەك شيانێن لوجستى و ئابوورى و ستراتيجى تەرخان كرن، بۆ بەرفرەهـ كرنا سياسەتا عەرەبكرن و راگواستن و ژێبرنا ناسناما كوردى ژ دەڤەرێن كوردى ل نيڤا دوێ يا ڤێ قوناغێ دكەفتە دمەسترين رەوشدا، كو تێدا نويترين تەكنيك و شێوازێ سەربازى و بەرفرەهترين پلان بۆ ژێبرن و ژناڤبرنا هەبوونا مللتێ كورد ل كوردستانێ. قۆناغا عەرەبكرنێ و راگواستنێ گوهورى ژ شێوازێ وێ يێ كەڤن بۆ شێوازێ نوى. ئەوژى قۆناغا (جينۆسايد بوو) و دڤێ قۆناغێدا ترسناك و توندترين تەكنولوجيا سەربازى و ياقەدەغەكرى بكارئينا بۆ قڕكرنا كوردان و ئەوژى بكارئينانا چەكێ كيمياوى بوو لێدانا بازێرێ حەلەبچە سالا (١٩٨٨). ل ئەيلولا (١٩٨٠) شەرێ خويناوى دناڤبەرا (ئيران و عيراقێ) دەستپێكر ژمارەكا ئێكجار زۆر ژ هەردوو لا بوونە قوربانێن ئەڤى شەرێ خويناوى و هەردوو وەلات توشى زيانێن ماددى يێن مەزن بوون. دڤى شەريدا كريارا عەرەبكرن و ڕاگواستنا ئاكنجيان مە زنتربوو، ب شێوەكێ بەرفرەهـ ئەڤ دەڤەرە ڤەگرتن:

١. ل پارێزگەها سلێمانيێ قەزا پێنجوێن و بازێركێ بيارە و بازێركێ سيوەيلو ئوردگايێ نالپارێز و گوندێن دەوروبەر.

٢. ل پارێزگەها هەولێر قەزا چۆمان و گوند و بازێرێن وى.

پشتی وێ رژێما عیراقێ سنووری (عیراق - ئیران - تورکیا) و (عیراق - سوریا) ب بەهانەیا پشتیا ئەمنی چول کرن و راگواستن، راگواستن هندی وێڤەتر بەرفرەهـ تربوو، ب جۆرەکێ د سالێن هەشتاندا ب کویراتیا (٤٠) کم دەڤەرێن کوردی راگواستن و ئاکنجیێن وان ل کۆمەلەکا ئوردگاییێ ب زۆر کۆمکرن، پشتی تاوانا مەزنا ئەنفال دەستپێکر. هەر ل دەمێ شەرێ هەشت سالی (عیراق - ئیران) کریارا راگواستن و خرکرنا کوردێن فەیلی ل بەغدا و رۆژهەلاتا بەغدا دەستپێکر، نێزیکی نیڤ ملیون کوردێن فەیلی بۆ سەر سنوورێن (عیراق و ئیران) ڤەگوهاستن، ب هێجەتا هندێ کو ئیرانی نە (التبعیة الایرانیة).

سالا ١٩٨٣ ژ تول ڤەکرنا شکەستنا سەربازی ئەوا بسەرێ رژێمێ هاتی دبەروکێن شەری لسەر دەستێ سوپایێ ئیرانێ ل بەروکێ شەری ل حاجی عومران کو بۆ بوویە ئەگەرێ ژ دەست دانا ڤێ دەڤەرێ. لەورا رابوون ب لێدانا بارزانییان، ل ئوردگاییێن قوشتەپە، بەحرکێ، حمرێن، دیانا ژمارا بارزانییێن بەر ئەڤێ هێرشێ کەفتین نێزیکی (٨٠٠٠) کەس بوون، هەمی نێرینە و ژیێ وان ژ (١٥) سالا پێهەل بوو. سەدام حسین دەربارەی چارە نڤیسی بارزانییان چ گۆمان نەهێلاینە کو دساخن دەمێ گوتی (ل ئەوان خیانەت ل پەیمانێ کر، لەورا مەژی گەهاندە سزایەکێ توند و دژوارا بۆ دوزەخێ (الجحیم) هنارت).

## تايبه‌تمه‌نديا هێرشێن دناڤبه‌را سالێن ( ١٩٨٧ - ١٩٨٩ ) بۆ سه‌ر ده‌ڤه‌رێن كورد لێ ئاكنجى ژلايێ سوپايێ به‌عسڤه‌ :

١. كوشتن و ژناڤبرن ب كۆم و بێ سه‌ر و شوين كرنا ده‌هان هزارا كه‌سێن مه‌ده‌نى، كو ژماره‌يه‌كا زۆر ژن و زارۆك و پير بوون و هنده‌ك جارا ب ته‌مامى ئاكنجيێن چه‌ند گونده‌كا پێكڤه‌ بوو.

٢. ب كارئينانا چه‌كێ كيمياوى دژى باژێرێ حه‌له‌بچه‌ و ده‌هان گوندێن كورد لێ ئاكنجى.

٣. وێرانكرنا نێزيكى (٤٥٠٠) گوندان، كو ل به‌لگه‌نامێن حكومه‌تيدا ناڤێ وان هاتى يه‌، (سوتاينه‌، تێكداينه‌، ڕاست كرينه‌).

٤. خرابكرنا مزگه‌فتا و قوتابخانا و نوخۆشخانا و كانى و ژيده‌رێن ئاڤێ و هه‌ر چى ده‌زگه‌هێن گشتى بوون ل ڤان ده‌ڤه‌ران.

٥. تالان كرنا سه‌روسامانێ وه‌لاتيێن كورد ژ لايێ سوپا و جاشێن كورد ئه‌وێن سه‌رب حوكمه‌تێڤه‌.

٦. ده‌سته‌سه‌ركرن و زيندانكرنا هزاران ئافره‌ت و زارۆك و پير، بۆ چه‌ند هه‌يڤا ل بارودۆخه‌كێ ئێكجار نه‌خۆش و دژوار ب به‌هانه‌ يا هندێ كو نه‌يارێن حكومه‌تێنه‌. ژماره‌يه‌كا گه‌له‌ك ژى ب ئه‌گه‌رێ به‌رخودانێ و نه‌خۆشيێ، ل گرتيخانان گيانێ خۆ ژ ده‌ست دان.

٧. ڤه‌گوهاستنا سه‌دان هزار ژ ئاكنجيێن گوندان، پشتى وێرانكرنا گوندێن وان، بۆ ده‌ڤه‌رێن دى دوير ژ وا جهێن وان.

## تێکدانا بنەما و ژێرخانا ئابووریا گوندێن کوردستانێ:

ل (١٩٨٧/٣/٢٩) ب بریارەکا سەرکردایەتیێ، حوکمێ بێ سنور دا (عەلی حەسەن ئەلمەجید)، پشتی وەرگرتنا ئەڤێ دەسەلاتێ، دەست ب سیاسەتەکا ترسناك و ژناڤبرنا بەرفرهەکر دژی تەڤاهیا ئاکنجیێن گوندێن کوردستانێ. ب فەرمانەکێ ل خزەیرانا ١٩٨٧، هەمی دەڤەرێن ئاکنجیێن گوندا کرنە دەڤەرەکا قەدەغەکری و فەرماندا بوێ کو هەر کەسەکێ ل ڤان دەڤەرادا بهێتە گرتن بێ پرسیارکرن، ئەوێن ژیێ وان ناڤبەرا (١٥ - ٧٠) سالا بهێنە سێدارەدان. لەورا ژبەر ترسا چەسپاندنا سزایێن ئەڤێ بریارێ خەلکەکێ زۆر گوندێن خۆ چولکرن و بەرەف باژێر و باژێرکان مشەختبوون.

## قۆناغا شەشێ: ( ١٩٩١ – ٢٠٠٠)

ئەڤ قوناغی پشتی داگیرکرنا کوێتێ ژ لایێ رژێما بەعسیڤە دەستپێدکەت. هەڤکێشا هەرێمێ و نیف دەولەتی بەرامبەر عیراقێ هاتە گوهورین و جیهان کەفتە درەوشەکا تایبەتمەندا. ل رۆژا (١٩٩١/١/١٧) هەڤپەیمانان د کریارەکا سەربازیدا ب ناڤێ باروڤا بیابانێ گورزەکێ مەزن داوەشاندە رژێما عیراقێ. عیراق ب شکەستنەکا مەزن ژوی شەری دەرکەفت. بەعسی ل نافخو لاوازبوون، هەر ژبەر وێ گەلێن عیراقێ ب عەرەب و کوردڤە دەست ب سەرهلدانێ کر، دڤێ سەرهلدانێدا راپەرینێ چەندەها باژێر ل کوردستان و باشوورێ عیراقێ هاتنە ئازادکرن. سەرهلدانا مەزنا بهارا سالا ١٩٩١ز و مشەختبوونا ملیونی ل هەمان سالدا، دەرفەتەکا گونجای بۆ کوردا پەیداکر دا ب رژدی بۆ ب دەستڤەئینانا مافێن خۆ کاربکەن،

چونکی ئەڤ سەرهلدانە دیرووکی هەمی ئەو دەڤەر ژی ڤەگرتن، کو بەعسی ئەو دەهان سالێ بوون مژیلێ نەهێلانا مۆرا نەتەوەیی یێ کوردان بوون.



مشەختبوونا کوردان ل سالا ١٩٩١ز

ل گولانا وێ سالێدا کورد چوونە دناڤ دانوستاندناندا دگەل حکومەتا عیراقێ، ب مەرەما ب دەستڤەئینان و چەسپاندنا مافێن خۆ ل عیراقێ، بەلێ ئەو دانوستاندن هەر زوی راوەستان، ژبەر وێ حکومەتا ئەوی دەمی یا عیراقێ چ جارا ب داخوازێن کوردا رازی نەبوو کو ئێك ژ وانا (ڤەگەراندنا دەربەدەرێن کەرکووکێ بۆ وارێ وان)، پروسا عەرەبکرنێ و راگواستنێ کو حکومەتا عیراقێ بەری هینگێ دەستپێکربوو، ل سالا ١٩٩١ بەرفرهەتر و مەترسیدارتر بوو ب تایبەتی بۆ تێکدانا بارێ ئێتوگرافی

و نەتەوەیی یا  پارێزگەها کەرکووکێ و باژێرێن دی یێن ل بن دەسەلاتا ڕژێما بەعسی هەتا کەفتنا رژێمێ ل (٢٠٠٣/٤/٩).




داخوازێن دەڤەرێن ڤەقەتیای بۆ بجهـ ئینانا مادێ (١٤٠) یێ دەستورێ نوییێ عیراقیێ.

هەر چەندە پشتی کەفتنا ڕژێما بەعسی چارە نڤێسێ دەڤەرێن ڤەقەتیای ب مادێ (١٤٠)یێ دستووری نوییێ عیراقێ هاتە گرێدان، کو ل دویف ئەڤێ ماوێ ڤیابا هەتا دوماهیا سالا (٢٠٠٧ز) کێشا پاقژکرنا رەگەزی ل وان دەڤەرا هاتبا چارەسەرکرن و چارە نڤێسێ وان هاتبا دیارکرن کو یان بچنە سەر سنورێ حکومەتا هەرێما کوردستانێ یان دگەل دەسهەلاتا ناڤەند بمینە ڤە. بەلێ هەتا کو نهو نەهاتیە بجهـ ئینان و ئەو بەندێن دستوری ژی دمسوگەرنینن لبەردەم هێزێن توندرەوێن عەرەبی هەتا کو بجهـ بهێت.

## قۆناغا حەفتێ: قۆناغا پشتی رژێمێ هەتا نهو:

قۆناغا پشتی کەفتنا بەعسی ل دەڤەرێن ڤەقەتیایی، ل سالا (٢٠٠٣ هەتا نهو)، کو کێشەکا زۆر ل سەرە، دناڤبەرا کورد و دەسەلاتا ناڤەندی ل بەغدا ژ لایەکی، و ئاکنجیێن کورد و گرۆپێن تیرورستی ژ لایەکێ دیڤە، کو گەف ل گیان و سامانێ وەلاتیێن کوردێن ئاکنجیێن دەڤەرێن (سەعدیە و جەلەولا و قرەتەپە و شنگال و رۆژئاڤایی کەرکووکێ) دکرن، و ب زۆری دەرئێخستن ژ جهێن وان بۆ دەڤەرێن ل بن دەسەلاتا حکومەتا هەرێما کوردستانێ. هەرچەندە حکومەتا نهو یا عیراقێ ب ئاشکرایی پەیرەوێ بەردەوامبوونا سیاسەتا عەرەبکرنێ و راگواستنێ ناکەت، بەلێ دبێدەنگ بوون و رێ نەگرت بەرامبەر گرۆپێن تیرورستی یێن نەژاد پەرێس ژ پاراستنا گیان و سامانێ وەلاتێن کورد و گیروکرنا ماددێ (١٤٠)ێ دستوری. ئەگەرێ وێ بۆ بەردەوامبوونا سیاسەتا عەرەبکرنێ و راگواستن و پاقژکرنا نەژادی گەلێ کورد ل دەڤەرێن ڤەقەتیاییێدا.



خۆ پێشاندانا تەخ و توێژێن کەرکووکێ دژی پەیرەوکرنا سیاسەتا (صدام)ی ژ ترساندن و دەرئێخستنا ئاکنجیێن وێ

## پرسیارێن پشکا ئێکێ

**پ ١/ ئەڤان زاراڤان پێناسە بکە:**

ب عەرەبکرن، ئێکەتیا سۆسیالیستا عەرەبی، شکەفتا دەکا، رێکەفتناما جەزائیر، پشتینەیا ئەمنی، باروڤا بیاڤانێ، ماددێ ١٤٠، قەسەبخانا لۆریا.

**پ ٢/ ئەڤان ڤالاهیا پر بکە:**

١. ب بریارا کۆمەلا نەتەوەیان ل ١٦ کانینا دووێ ١٩٢٥ز ______ ب فەرمی بوو پشکەك ژ لەشێ دەولەتا عیراقێ.

٢. لدویف یاسایا هژمارا ٢٩ یا سالا ١٩٣٨ز مافێ مولکداریێ ب فەرمی دا هۆزێن عەرەب ل دەڤەرێن کوردی ئاکنجیکرنا ب تایبەتی ل ______ ، ______ ، ______ ، ______ ، ______ .

٣. قەسەبخانا باژێرێ سلێمانیێ ل ______ سالا ______ بوویە ئەگەرێ گوللە بارانکرنا (٢٨٠) هاولاتیێن کورد.

٤. ل ڕۆژا ______ هێزا ئەسمانیا عیراقێ هێرشەکا درندانە کرە سەر باژێرێ قەلادزێ و بوو ئەگەرێ گیانێ دەستدانا ______ کەسا.

**پ ٣/ ئەگەرێ ڤانا ڕوون بکە:**

١. پشتی گرێدانا ویلایەتا مویسلێ (باشوورێ کوردستانێ) ب دەولەتا نویا عیراقی ڤە، کورد ژ پرانیا نەتەوەیی دبێتە کێمینە لدویف عیراقێ.

٢. دەسەلاتدارێن عیراقێ بەردەوام پلان و نەخشە د دارشتینە بۆ دارشتنا پێکهاتنێن نەتەوەیی و دیموگرافی ل کوردستانێ.

٣. دامەزراندنا کۆمارا ئێکەتیا عەرەبی کوردا ب مەترسییەکا مەزن بۆ سەر ناسناما نەتەوەیا خۆ دزانی.

٤. قۆناغێن دناڤبەرا سالێن (١٩٨٠ - ١٩٩١) ب مەترسیدارترین رەوش دهێتە دانان ژ سیاسەتا عەرەبکرن و راگواستنا کوردان.

**پ ٤/ شێوازێ راگواستنا کوردان پشتی رێکەفتناما جەزائیرێ ب چ شێواز هاتە ئەنجام دان.**

**پ ٥/ بۆ پەیرەوکرنا سیاسەتا عەرەبکرنێ و راگواستنێ کوردان پشتی کودەتایا (انقلاب) پاسەوانێن نەتەوەیی چ رێك پەیرەو دکر.**

**پ ٦/ ئاکنجیێن کورد ل کوردستانا عیراقێ ل دویف ئامارا سالا ١٩٧٥ز چەوا دهێتە پۆلینکرن.**

**پ ٧/ ئەڤێ دەستەواژێ چەوا شرۆڤە دکەی: (کورد پشکەکە ژ نەتەوەیێ عەرەب و کوردستان ژی پشکەکە ژ نیشتیمانێ عەرەبی).**

**پ ٨/ تایبەتمەندیێن هێرشێن دناڤبەرا (١٩٨٧ - ١٩٨٩) بۆ سەر دەڤەرێن کورد لێ ئاکنجی.**

# پشکا دووێ

# کـوردێن فەیلی

## کورتییەکا دیرۆکی دەربارەی کوردێن فەیلی:

کوردێن فەیلی ب درێژاهیا دیرۆکێ ل رۆژهەلاتا دیجلە ژیاینە. و پشکەکا نە ڤەقەتیاینە ژ نەتەوێ کورد. ئەڤ زاراڤە (فەیلی) بۆ کۆمەلاەکا هۆزەکا لوڕی دهێتە گوتن، ئاکنجیێن (پێشکۆ و پشتکۆ) یێ زنجیرا چیاییێن زاگروس بوون، پڕانیا دیرۆك نڤێسان د ڕێکەفتینە ل سەر هندێ! کو دنەژادی ئیلامی یان گۆتی نە، ل ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ ژیاینە، ل دەڤەرێن (مەندەلی، زرباتیە، بەدرە، جەسان، خانەقین، کەرکووك، بەغدا، کوت، عەمارە وبەسرە).

رۆژهەلاتناسێ روسی (فلادمێر مینۆرسکی) و هەر ئێك ژ (جۆن مالکۆن و براون) و توێژەرێ کوردی (د. اسماعیل قوماندار) پشتەڤانیا وێ بووچونێ دکەن، کو باوەریا وان دەسپێکێن دەرکەفتنا زاراڤێ (فەیلی) ل سەدێ شازدێ بوویە، بۆ جوداکرنا میرنشینا (لوڕی بچووك) و حوکمرانیا وێ کو خۆ ب لوڕی ڕەسەن ددانا، ب بەراوردی دگەل (لوڕی مەزن) کو وان ددانا، لوڕی بچووك پشکەکن ژ لوڕی مەزن، نەك ڕەسەن و بنچینە، زێدەباری هندێ ئەڤ زاراڤە ل ڤان دەڤەرا کێم ب کارهاتینە، بەلێ ل سەدێ نۆزدێ بتنێ ژ لایێ ئاکنجییێن پشتکۆ ب کارهاتیە، ل سەر دەمێ نهو و ئەڤ زاراڤە بتنێ بۆ وان کوردا بکاردهێت کو ئاکنجییێن وان دەڤەرانە ئەوێن بەر دەولەتا عیراقێ کەفتین، پشتی دیارکرنا سنورێ دناڤبەرا ئیران و

ئۆسمانیا ل سالا ١٩٠٥ز. بەلێ ئاکنجییێن خانەقین و مەندەلی کو کوردێن گەرمە سێرێن، ئەڤی زاراڤی بۆ نیاسینا خۆ بکارنائینن. زاراڤێ کوردێ فەیلی بۆ جوداکرنا ئەوێ تەخا کوردی بکاردئینن، کو ب رێبازا ئاینیڤە ژ پەیرەوێن شیعە مەزهەبن، ئانکو ناڤکرنا وان ل سەر بنەمایێ مەزهەبیە نەك نەتەویی.

هندەك ژ توێژەران باوەریا وان ئەوە کو ناغێ زاراڤێ فەیلی، ژ ناڤێ پشایێ ئیلامی (بیلی) هاتیە ، کو بنەمالێن دەولەتا (ئیلامیان) ل سالا (٢٦٧٠ ب.ز) دامەزراندیە. ناڤێ (بیلی) ب درێژهیا سەردەمی هاتیە گوهورین بۆ (فەیلی)، ب گوهورینا (با) بۆ (فا)، هەروەك گوهورینا ناڤێ (بارس) بۆ (فارس) یێ نهو. (بهلە) وەك رووبەرەکێ جوگرافی بۆ جارا ئێکێ د ژێدەرێن عەرەبی یێن ئیسلامیدا هاتیە، ل سەدێ دەهێ زایینی ل پەرتووکا (مختلر تاریخ البلدان) یێ (ابن فقیه الهمدانی) ئاماژە پێکریە، ئەڤ دەڤەرە ڤەدگەرێتە (هەمەدان، ماسین (ئیلام)، سمرە (درشهر)، ماە البصرة (نهاوند)، ماە الکوفە (دینور) (و کرمنشاە). ابن ندیم ل پەرتووکا (الفهرست) دا هەر بەحسێ باژێرا دکەت کو سەر ب (فهلە)نە، هەروەك (تەبەری) ل پەرتووکا (تاریخ الرسل و الملوك) کو (فهلو) خەلکێ هەرێما چیانن. ل ڤێرێ بۆ مە دەردکەڤیت کو کوردێن فەیلی ئاکنجییێن وێ پەرێ باشوورێ کوردستانێنە. ئەو دەڤەر ژی بتنێ (پشتکۆ) و (پێشکۆ) ڤەدگریت. ناڤێ (لوڕ) دبێژنە وان هۆزا کو ل پشکا ڕۆژهەلات و باشوورێ کوردستانێ دئاکنجینە و دبێژنە هەمی لوڕێن ئاکنجیا ل عیراقێ (فەیلی).

## دەستپێكا كارەساتا كوردێن فەیلی :

كێشا كوردێن فەیلی وەك كێشا عەرەبێن شیعە یا گرێدایبوو ب وێ ململانا سیاسییا دویر و درێژ دناڤبەرا هەردوو دەولەتێن ئۆسمانی تورك و سەفەری ئیرانی، كو رێخوشكەربوو بۆ دابەشكرنا ئاكنجیێن دەڤەرێ دناڤبەرا دویفكەفتیێن ئیرانێ و ئۆسمانیا. گەلەك ژ شیعێن عیراقێ ب دویفكەفتیێن ئیرانێ هاتنە تۆماركرن كو ل ناڤەندا كوردێن فەیلی بوون ل دەستپێكا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ رویبرِی جوداكرنێ بووینە دگەل تەخ و چینێن دی یێن جڤاكێ عیراقێ.



كوردێن فەیلی ل خیڤەتگەهێن سەر سنوورێ ئیرانێ

ل سالا ١٩٢٤ز یاسایا رەگەزناما عیراقێ دا كوكی ل سەر دابەشكرنا گەلێ عیراقێ كریە بۆ سێ پشكا ل سەر بنەمایێ ئایین و نەتەوە. كودرێن فەیلی ژبەر هندێ كو پەیرەوێن رێبازا شیعە مەزهەب بوون، ب نەژاد ئیرانی هاتنە تۆماركرن، لەورا ب بەردەوامی كەفتنە بەر هێرشا دەسەلاتدارێن عیراقی.

دگەل دەست ب سەرداگرتنا دەسەلاتێ ژ لایێ بەعسیانڤە ل سالا ١٩٦٨ز و ل دویڤ دا، کوردێن فەیلی روی ب روی هەوا توندیا راگواستنێ و ژناڤبرنێ بوون، ل دەستپێکا سالێن حەفتێیان نێزیکی (٤٠٠٠٠) چل هزار کوردێن فەیلی راگواستنە ئیرانێ ب بەهانەیا هندێ کو د نەژاد ئیرانینە. ل درێژەپێدانا ئەڤێ سیاسەتا ڕەگەز پەرێسانە ل سالا ١٩٨٠ز ل دویڤ بریارا هژمارە (٦٦٦) مافێ وەلاتیبوونێ ژێستاند، ئەڤجا دەست بسەر مالێ و سمانێ وان دا گرت.

ئارمانجا ژناڤبرنا ئەڤێ تەخا رەسەنا گەلێ کورد، بۆ بنبڕکرنا کوردابوو ل بەغدا و جهێن ئاکنجیێن عەرەب ل عیراقێ، هژمارەکا ئێکجارا مەزن ژ وان تووشی دژوارترین رەفتارێن دڕندانە و نەمرۆڤانەبوون ب رێیا دەستەسەرکرنا ژان و کوشتنا زەلام و زارۆکان دەستپێکرن کو ددیرۆکێدا کێم وێنەبو. زێدەباری ڤێ هەمیێ زورداریا لێ دهاتە کرن، هەر ب وێ نە راوەستان بەلکو دەست ب ڕەشبنیکرنا هزاران گەنجێن فەیلی وەك بارمتە، کو هەتا نهو دبێ سەروشین و چ پێزانینا دەربارێ وان نزانن.

رژێمێ تێگەهێ نەژادێ ئیرانی کرە بەهانە بۆ راگواستنا وان. ب کۆمەلێ ل دەڤەرێن بەغدا و باژێر و باژێرکێن دی یێن عیراقێ دویرئێخستن بۆ سنوورێن عیراقێ بەری و پشتی شەرێ (١٩٨٠ - ١٩٨٨ز) بێ گوهدانا هیچ یاسا و مافەکێ دیرۆکی یێ ڤی گەلی.

ل سالا (١٩٨٠ز) وەزیرێ ناڤخویێ عیراقێ بریارەك دەرئێخست ب دویرخستنا وان کەسان کو ب نەژاد دئیرانینە و دعیراقێدا دژین، رەگەزناما عیراقی نینە. دچارچوڤێ ڤێ بریارێ ئەو گەنجێن کو ژییێ وان دناڤبەرا (١٨ - ٢٨ ) سالییێداوەك

دەستەسەرکەر ژ لایێ رژێمێ ڤە مان ئەوێن دی ژی بەرەف سنوورێن ئیرانێ هاتنە دویرئێخستن. وێ بریارێ داکوکی ل سەر وێ کرییە هەر کەسەکێ بڤێت بۆ عیراقێ ڤەگەرێت دڤێت بهێتە گوللە بارانکرن.

ل دویڤ چەوساندن و توند و تیژیێ، سەروکێ بەرێ یێ عیراقێ (صدام حسین)ی داهێنانەکا نوی ئینا گورێ، ئەو زەلامێ عیراقی و ژنا وی فەیلی بیت دڤێت ژێك ڤە ببن بەرامبەر (٤٠٠٠) چار هزار دینار ئەگەر سەربازبیت و (٢٥٠٠) دوو هزار و پێنج سەد دینار ئەگەر سڤیل بیت.



دەرئێخستنا کوردێن فەیلی بۆ سنوورێن ئیرانێ (دەرگەهێ منزریە) بێ هیچ پێدڤییەکا

چارچوڤێ بەردەوامبوونا سیاسەتا بنبرکرنا کورد، بتنێ ل ٤ێ ئەیلولێ ل سالا ١٩٨٠از (٥٠٠٠) پێنج هزار کوردی فەیلی ب کۆمەڵ هاتنە ژناڤبرن ل دویڤ ئامارێن

**خاچا سوور و هەیڤا سوورا نیف دەولەتی (٤٠٠٠٠٠) چار سەد هزار وەلاتیـێن فـەیلی بوونە قوربانیێ ڤێ سیاسەتا ڕژێمێ ب کوشتن و ڕاگواستنێ.**



ل بیرهاتنا (٢٩) سالێیا راگواستنا کوردێن فەیلی ل رۆژا (٢٠٠٩/٤/٣ز) ل جادا کیفاح ل بەغدا، بنگەهێ کوردێن فەیلی

**پشتێ کەفتنا رژێمێ، ل سالا (٢٠٠٦ز) یاسایا رەگەزناما عیراقی بریارا (٦٦٦) ل سالا ١٩٨٠ز هەلوەشاندن کو یا گرێدایبوو ب ستاندنا رەگەزناما عیراقی ژ لایێ رژێما بەرێڤە. هژمارەك شییان مافێن خۆ ب دەستڤەبینن بەلێ هژمارەکا دی هەتا نهو نەشیاینە وان مافا ب دەستڤەبینن، چونکی بۆ ڤەگەراندنا مافێن خۆ پێدڤی ب بەلگەناما هەیە کو نەژادێ عیراقیا خۆ دیارکەت، دڤێت ل سەر ژمێریا سالا ١٩٥٧ز هاتبنە تۆمارکرن، بەلێ خەلکەکێ زۆر بەلگەنامێن وان نەمابوون ژبەر هندێ رژێمێ ل دەمێ هێرشێن دەرئێخستنێ و گرتنێ ژناڤبربوون.**



دادگەها بلندا تاوانێن عیراقیێ کێشا کوردێن فەیلی ب جینۆساید دا نیاسین.

## پرسیارێن پشکا دووێ

**پ١/ ئەڤان زاراڤا پێناسە بکە:**

**کوردێ فەیلی، دویفکەتنێن ئیرانی (التبعیە الایرانیە)،**

**دەولەتا ئیسلامی، پشتکۆ پێشکۆ.**

**پ٢/ ئەڤان ڤالاهیا پڕ بکە:**

**١. کوردێن فەیلی ب درێژاهیا دیرۆکێ ل ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ ژیاینە، ل ڤان دەڤەرا .......... ، .......... .**

**٢. دچارچوڤێ بنبڕکرنا کوردا بتنێ ل رێکەفتی ............ پێنج هزار کوردێن فەیلی ب کۆمەڵ هاتنە ژناڤبرن.**

**پ٣/ بریارا هژمارا ٦٦٦ یا سالا ١٩٨٠ چەوا مافێن کوردێن فەیلی پێشیل کرن.**

# پشکا سێیێ

## کۆمەڵکوژا بارزانییان

بارزان دەڤەرەکا چیاییە، دکەڤیتە نێزیك سێگوشا سنووری (ئیران و تورکیا و عیراق)ێ ل پارێزگەها هەولێرێ ئاکنجیێن وێ ژ لایێ دیموگرافیڤە ب سەر نێزیکی (٤٠٠) چار سەد گوندا دابەش دبن.




نەخشێ ژمارە (٢) دابەش بوونا هۆزێن بارزان *

---

* سەردار محمد عبدالرحمن، هوشیار محمد أمین خوشناو (ئەتلەسا دیرۆکا بزاڤا ڕزگاری)

بارزانی ژ ئێکگرتنا حەفت هۆزێن دەڤەرێ پێکهاتبوون، (شێروانی، بەڕۆژی، نزاری، دۆلەمەڕین مزووری، هەرکی بنەجێ و گەردی). ئەڤ هۆزە ژ پەیرەوێن شێخێن بارزانینە، هەر ل بن ڤێ خیڤەتێ ئێکدوو گرتییە بناڤێ بارزانی، کو ژ ناڤێ گوندێ بارزان هاتییە و مەزارگەها خودانێ بارزانە.

ئاکنجیێن ڤێ دەڤەرێ بەری دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ یا نوی ل سەردەمێ ئۆسمانیان تووشی گرتنێ و ڕاهێلانێ و گوشتنێ بووینە، پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقا نوی ژی کارەساتێن وان کێم نەبووینەڤە، بەلکو رۆژ بۆ رۆژێ بەرەڤ زێدەبوونێ چوویە، ژ راگواستنێ و کوشتنێ و دەربەدەربوونێ چ بۆ ژ دەرڤەی کوردستانا عیراقێ بیت یان بۆ ناڤخۆ.

هەر جارەکێ چەندین کەس بووینە قوربانی و تالان کرنا مالێ و سامانێێن وان و سوتاندنا وێرانکرنا وان ژ لایێ رژێمێن ئێك ل دویڤ ئێکێن عیراقێ.

## ڕاگواستنا بارزانییان:

ئەڤ دەڤەرە ژی هەروەکو دەڤەرێن دی یێن ئاکنجیێن کورد دگەل سەرهلدانا هەر بزاڤەکا نەتەوەیی یا ئازادیخواز، حکومەتێن عیراقی هەمی رێك بکاردئینان بۆ لێدان و ژناڤبرن و ڕاگواستن و بتالان کرنا مالێ و سامانێ ئاکنجیێن وێ هەر جارەکێ ڤەشکاندنەکا جودا دئێخستە پالێ گەلێ کورد، هەر جارەکێ بەهانەکێ جارەکێ بناڤێ جودابوونێ و جارەکێ ب ناڤێ کرێگرتیێن ولاتێن بیانێ و دەوروبەر، بۆ هندێ دا ببتە بەهانەیەك بۆ ڕێخوشکرن و لێدانا دەڤەرێن کورد لێ ئاکنجی و بجهئینانا مەرەمێن خۆ ژ عەرەب کرنێ و حەلاندناگلێ کورد ژ قالبێ

نەتەوەییێ عەرەبدا، لەورا رۆژ بۆ رۆژێ هێرشێن وان ب توندتربوون و قوربانی و پێشێلکرنا مافێن مرۆڤی ژی زێدەتردبوون. بارزانی ژ ڤان هێرشان پشکا شێری بەرکەفتبوو، چەندین جارا ژ وارێ باب و باپیران هاتنە راگواستن و تالانکرن. هەر ل دەستپێکا سیهێن سەدێ رابردوو کەفتنە بەر هێرشا لەشکەرێ پیادەییێ عیراقێ و ب پشتەڤانیا فروکێن جەنگی یێن ئینگلیزی چەندین گوند وێرانکرن وئاکنجیێن وان بەرەف تورکیا رەڤین.



کۆمەلگەها بارزانییان ل قوشتەپە، دویر ژ پێدڤیێن ژیانێ

ل چریا ئێکێ ل سالا ١٩٤٥ز دیسان جارەکا دی گوندێن وان وێرانکرن و هژمارەکا زۆر ژ ئاکنجیێن وان ئاوارەودەوروبەرێ ئیرانێ بوون. ل نیسانا سالا ١٩٤٧ز جارەکا دی ئەو خەلکێ مایێن ژ ژن و زارۆك و پیرا ل (دیانا) دەستەسەرکرن زولام ژی بۆ زیندانێن (کەرکووك، مویسل، بەغدا، بەسرە) هاتنە راگواستن، بۆ چەند سالا مان پاشی خێزانێن وان بسەر گوندێن دهۆکێ دابەشکرن.

پشتی ڕێککەفتناما جەزائیر کو دناڤبەرا شاهێ ئیرانێ و حکومەتا عیراقێ ل سالا ١٩٧٥ز هاتیە ئیمزاکرن دژی بزاڤا گەلێ کورد بوو ئەگەرێ شکەستنا وێ بزاڤێ. حکومەتا عیراقێ ئەڤ دەلیڤە ب دەرفەت زانی و کەفتە گیانێ گەلێ کورد ب گشتی، بارزانی ژی پشکەك بوون کەفتینە بەرڤان هێرشێن نەمرۆڤانە. پشتی سالا ١٩٧٥ز پروسا ڕاگواستنێ بەرفرهەتر کر و هندەك ژ وان بەرەف ئیرانێ چوون و هندەکێن دی ژی ڤەگەریانە ناف کوردستانێ.



شوونوارێن توپ بارانکرنا ئوردوگایێ زێوە ژ لایێ فروکێن جەنگیێن عیراقێ

ئەوێن گەهشتینە ئیرانێ ل کۆمەڵگەهێن سنووری نێزیك عیراقێ هاتنە ئاکنجیکرن ب تایبەتی ئۆردوگایێ زێوە کو چەندین جارا ژ لایێ فروکێن جەنگیێن عیراقی ب ناپالا هاتنە توپ بارانکرن، ژ ئەنجامێ وێ هێرشێ گەلەك قوربانی دان.

ئـەوێن ڤەگەریاینـە کوردسـتانێ ژی ڕژێمـێ بـەرەف بیابـانێن باشـووری عیراقـێ ڕاگواسـتن. و ل پارێزگـەها دیوانیـە ل نـاحییێن (جحـیش، خیریـە و مەجوجیـە) ل گۆمەلگەها خووجهکرن. و پشتی وێ چەندێ ژی گوندێن وان ویرانکرن و فـەرمان ژی دا هـەر کەسـێ ڤەگەرێتـە گونـدێ خـۆ دێ هێتـە سـێدارەدان. ئـەو خـەلکێ ل دەڤـەرێ ژی مـاین بـۆ کۆمەڵـگەهێن ب زۆری ل هـەریر و دەوروبـەرێن هـەولێرێ هاتنە راگواستن و گوندێن وان ژی دگەل ئەردی راست کرن.

بارزانییێن راگواستییێن دیوانیـە ل سـالا ١٩٨٠ز ڤەگەراندنـە کۆمەڵگەهێن ب زۆری ل قوشـتپە ل هـەردوو گومەلگـەها (قـودس و قادسـیة) خـۆجهکرن بـێ چ پێدڤییـەکا مرۆڤانە.




نەخشێ ژمارە (٣) دابەشبوونا کۆمەلگەهێن ب زۆری ل هەرێما کوردستانێ *

---

* د نەخشێن سەردار محمد عبدالرحمن (ئەتلەسا هەرێما کوردستانا عیراقێ).

## جینۆسایدکرنا بارزانییان:

پشتی هەلبۆونا شەڕی دناڤبەرا عیراقێ و ئیرانێ، رژێمێ ل پڕانیا بەروکێن شەریدا شکەستن دخار ب تایبەتی ل بەروکێن شەڕی ل کوردستانێ، ئەڤە ژ لایەکی و ژ لایەکی دی نەپشکداریکرنا وان دناف رێزێن سوپایێ عیراقێ و نەپشکداریکرنا گەنجێن کورد ل (شەڕێ قادسیە) و چوونە دناف رێزێن پێشمەرگەهی، بۆ رژێمێ بۆو بارگرانیەکا مەزن بۆ کونترولکرنا دەڤەرێ. ب تایبەتی پشتی شکەستنێن سوپایێ عیراقێ ل بەروکێن حاجی ئۆمەران بۆ رژێمێ بۆو بەهانەیەك بۆ تول ڤەکرنێ ژ کوردا ب گشتی و بارزانیان ب تایبەتی کو وەسا دیاردکر هەفکاریا سوپایێ ئیرانیا کریە بۆ داگیرکرنا دەڤەرێن سنووری یێن بەروکێ حاجی ئۆمەران.

ل تیرمەها سالا ١٩٨٣ز رژێمێ ب هێزەکا مەزن کو پێکهاتبۆو ژ دەزگەهێن ئاسایشێ پاسەوانێن کۆماری، هەردوو کۆمەلگەهێن (قودس و قادسیە) دورپێچدان ل بازێکێ قوشتپە کو بارزانی تێدا خوجهبۆون، دەست ب گرتنا نێرینەیێن ژییێ (١٥) سالی هەتا کو پیرەمێرێن (٩٠) سالی کر و راپێچانە دناف پاسێن پەردەکری و بەرەف جهێن نەدیار ڤەگوهاستن. ل هەیڤا تەباخا هەمان سالێدا هێرش کرە سەر کۆمەلگەهێن ب زۆری (بەحرکێ و هەریر و دیانا) یێن نێر دەسگیرکرن و ب پاسێن مەزن بەرەف باشووری رەوانەکرن. ل هەیڤا چریا ئێکێ دووبارە ب سەر هەردوو کۆمەلگەها (قودس و قادسیە) داگرت بۆ هندێ دا وان زارۆکێن نێر کو جارا بەرێ نەگرتبۆون، ئەڤێ جارێ هەمی گرتن ل ڤان هێرشێن گرتن و راهێلانێدا نێزیکێ

(٨٠٠٠) هەشت هزار بارزانی ژ گەنج و پیرا ب ساخ و نەخوشاڤە، هەتا ئەوێن ژ لایێ دەروونی ژیڤە د نەتەمام گرتن و بێ سەروشینکرن.

ل دویف بەلگەناما ئەو زەلامێن بارزانی یێ ژییێ وان ژ (١٥) سالی و پێهەل بۆ بەغدا ڤەگوهاستن و رەوانەی دادگەها بناڤێ شۆرش کرن، لڤێ دادگەهێ پتریا وان حوکمێ سێدارەدانێ بسەردا سەپاند پشتی هینگێ ئەو حوکم ب جه دئینا هەرچەندە ئەو تۆمەتێن (اتهام) ئاراستەیێ وان کەسان کرین دبێ رامان و نە د دروست بۆون بەلێ ب دادگەهەکا ڕوخساری سزایێ سێدارەدانێ بسەر سەپاندن هندەك ژی پشتی گرتنا وان ڤەگوهاستنە باشوورێ عیراقێ. رەوانەیێ پارێزگەها موسەنا کرن و ل ئوردوگایێن (ئەبۆجدوئەلیە) دا دەستەسەرکرن، ئەڤ جهە (٤٥) کم ژ سنوورێ سعودییێ دویرە و دەڤەرەکا بیابانییا خیزییە.



دایکان ل سەر گۆرێ کەس و کارێن خۆ پشتی ئینانا وان ژ بیابانا بوسەیە ل موسەنا

## ب ساخى بن ئاخكرن:

بـــارزانى ب شـــێوازێن جوداجـــودا ب ســـاخى بـــن ئـــاخ كـــرن، ل دويـــڤ راســـپاردێن رێڤەبـــەرێ ئاساييشـــا گشـــتى ل دەســـپێكا هـــەيڤا تـــەباخێ ل ســـالا ١٩٨٣ز فـــەرمانا سـێدارەدانێ بســەر پشــكەكێ ژ وان ب جهـ ئينــا و (١٦) دۆز بــۆ (٦٦٧) شــەش ســەد و شێست و حەفت كەسان رێكخست و حـوكمێ سێدارەدانێ ل سـەر دانـا و پشـكێن دى ژى ب شێوازێن جوراوجۆر ل (بوسەيە) ل باشوورێ رۆژئاڤايێ عيراقێ ب ساخى بن ئاخكرن. پشتى كەفتنا ڕژێمێ ل سالا ٢٠٠٣ز، ل هـەيڤا چـريا ئێكـێ ل سـالا ٢٠٠٥ز ب رێورەسمەكێ هەژيدا تەرمێ (٥١٣) پێنـچ سەد و سێزدە كەسان كو ل گۆڕێن ب كوم ل بيابانــا (بوســەيە) ب ســاخى بــن ئــاخكربوون، ڤەگەراندنەڤـە ل ســەروارێ بــاب و باپيران ل نێزيك بارزان دووبارە هاتنە ڤەشارتن.



ڕێورەسمێ دووبارە ڤەشارتنا ب ساخى بن ئاخكەريێن بارزانى ل كوردستانا بارزان

## پرسیارێن پشکا سیێ

**پ١/ ئەڤان زاراڤا پێناسە بکە:**

بارزانی، کۆمەلگەها قودس و قادسیە، بیابانا بوسەیە، ئوردوگایێ زێوە.

**پ ٢/ جینۆسایدکرنا بارزانییان ل تیرمەها ١٩٨٣ز روونبکە.**

**پ ٣/ ئەڤێ دەستەواژێ روونبکە:**

(ئەوان خیانەت ل سوز و پەیمانا کر، لەورا مە ژی گەهاندنە سزایەکێ توند و دژوار و بۆ دوزەخێ هنارتن).

**پ ٤ / ل هەر جهەکێ ڤێ کوردستانێ تە چ دیتیە یان بۆ هەوە هاتیە گو تن دەربارەی بارزانییان، یان هەر گروپەکێ دییێ کورد ب چیرۆك یان ب ڕاپۆرت بنڤێسە و ل پۆلێ بۆ هەڤالێن خۆ بخوینە.**

## پشکا چواریَ

### ب کارئینانا چەکێ کوژەکێ کیمیاوی

**ب چەکێ کیمیاوی دێ هەمی (کوردان) کوژم. کێ دڤێت ئاخفتنەکێ بێژیت هەر چ دبێژیت بلا بێژیت! جڤاکێ نیڤ دەولەتی و ئەوێ ژی گوهێ خۆ دەنە وان.**

**(عەلی حەسەن ئەلمەجید)**

وەك ل پشکێن بەری هینگێ مەبەحسکری، پشتی گرێدانا ویلایەتا مویسل ب عیراقا عەرەبی ڤە. کێشا کورد تێکەل ب هەڤکێشا سیاسیێن عیراقی کر. ب درێژیا دیرۆکا دەولەتا عیراقێ کێشا کوردی ببۆ مەترسی و بەردەوام رژێمێن عیراقێ دلگران کرینە. بۆ چارەسەرکرنا ڤێ کێشێ چ رژێمێن عیراقێ نەشیاینە رێکە چارەکا دروست ببینن و ئاکنجیێن عیراقێ ژ مەترسیێ دویربێخن، تنێ زمانێ چەکی ب کاردهاتییە بۆ چارەسەرکرنا ڤێ کێشێ چونکی سەرانێن رژێمێ دوێ باوەرێدابوون کوردستان پشکەکا نەڤەقەتیایە ژ نیشتمانی عەرەبی و گەلێ کورد ژی پشکەکە ژ نەتەوێ عەرەب کو گەلێ عیراقێ پشکەکە ژ ڤی چارچوڤەی. هەر ژبەر هندێ بوو سیاسەتا بنبڕکرنا رەگەزێ کورد ل دەسپێکێ ب عەرەب کرنێ و راگواستنێ دەسپێکر هەتا گەهشتیە وێ تاوانا مەزن کو چەکێ کۆمکوژ و کیمیاوی یێ قەدەغەکریێ نیڤ دەولەتی بکاردئینا.

ل درێژەپێدانا سیاسەتا راگواستنێ ل سالا ١٩٨٧ز گوندێن سەر چەمچەماڵ و کۆیە و قەلادزێ و دەڤەرا سلێمانیێ نەچارکرن گوندێن خۆ ب جهـ بهێلن، دیارە ئەڤ کارە

ژی جهێ نەرازیبوونا خەلکێ وی بوو، لەورا رژێمێ ل نیسانا ١٩٨٧ز ب چەکێ کیمیاوی هێرش کرە سەر وان. بریندارێن ڤێ هێرشێ کو قەستا نەخوشخانێن ل بن دەسەلاتا رژێمێ کر بۆ چارەسەرکرنا خۆ. دەرگەهێن وان نەخوشخانا بەرامبەر وان گرت و چارەسەرکرنا وان قەدەغەکر، ئێکەم هێرشا چەکێ کیمیاوی بۆ سەر دەڤەرێن کورد لێ ئاکنجی ل کوردستانێ ل ١٥ ێ نیسانا ١٩٨٧ز ب رێیا فروکێن جەنگی دەسپێکر بۆ سەر دەڤەرێن سۆران و رەواندوز و دوکان و سەرچنار و کوندێن مەرگە و پشدەر، هێرشێن وان ب گازا ژەهراوی یا بەردەوام بوو هەتا ٢١ نیسانێ ١٩٨٧ز، ل ڤان هێرشان گەلەك گوند ژ دەڤەرێن خۆشناوەتی و نهالا بالیسان و دەوروبەرێن سلێمانیێ و قەرەداغ بەرکەفتن. ل پارێزگەها دهۆکێ ژی هندەك گوند بسەر باژێرکێ ئەتروش و باکرمان کیمیا بارانکرن. ل ٢٤ێ گولانا ١٩٨٧ز هێرشا ئەسمانی ب چەکێ کیمیاوی کرە سەر دەروبەرێن باژێرێ کەرکووکێ کو بتنێ ٢٠ کم ل باژێری یا دویربوو وەك (گورگان و تۆمار). ل ئەیلولا ١٩٨٧ز و دویڤدا مەزنترین هێرشا کیمیاوی کرە سەر نهالا جافایەتی کو دکەڤیتە دناڤبەرا باژێرێ سلێمانیێ و کەلادزێ. ل ٣٠ ئەیلولێ پتر ژ ٣٠ گوندێن ڤێ دەڤەرێ ب گازا کیمیاوی توپ بارنکرن هندەك ژۆ وان بۆ جارا دووێ و سێییێ بوو.

ل ٦ ێ ئەیلولێ دەوروبەرێن باژێرکێن شەقلاوە و کۆیە و ب درێژاهیا چیایێ سەفین کیمیا بارانکرن، ب تایبەتی دەڤەرا هیران و نازەنین بۆ چەند جارا.




نەخشێ ژمارە (٤) دەڤەرێن کیمیا بارانکریێن هەرێما کوردستانێ*

---

* نەخشێن سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتلەسا هەرێما کوردستانا عیراقێ.

ل ١٧ای ئەیلولا ١٩٨٧ فروکێن جەنگییێن رژێمێ ب چەکێ کیمیاوی هێرش کره سەر دەڤەرا بەهدینان، ب تایبەتی ئەو کۆمەلگەهێن ب زۆری کو کورد و ئاشوری تێدابوون نێزیکی سنۆرێ تورکیا، کو پرانیا ئاکنجییێن وان خەلکێن دهۆك و ئەتروش و ئەلقوشێ بوون، ژ ترسێن رژێمێ رەڤیبوون، ئەو خەلکێ رەڤی ل سنوورێن تورکیا کۆمبوون، حکومەتا تورکیا ب هیچ رەنگەکی رێ نە ددایێ دەربازبنە ناڤ ئاخا وێ گەف کرن ئەوێ سنووری ببەزینیت دێ دەستێ حکومەتا عیراقێ کەت، ب تایبەتی ئاکنجییێن کۆمەلگەها ب زۆری (گوندێ کانی) رژێمێ جارەکا دی ل هەیڤێن (١٠، ١١، ١٢)ی سالا ١٩٨٧ێ سنوورێن تورکیا و ئیرانێ دەڤەرێن کوردی کیمیا بارانکرن. ب بەردەوامی خۆ ژ وان گوتگوتکا دپاراست، کو بەحسێ کیمیا بارانکرنا دەڤەرێن کوردی دکر.

(کۆمەلا گەلان گەف لێکرن)، بەلاڤکر، کو رژێما عیراقی ل هەیڤا نیسانێ هەتا چریا ئێکێ ل سالا ١٩٨٧ێ پتر ژ (٢٠٠) دووسەد گوند ل کوردستانا عیراقێ ب چەکێ کیمیاوی تۆپبارن کرن. پتر ژ (٥٦٠) پێنج سەد و شێست کەسان بوونە قوربانێن چەکێ کیمیاوی، کو شوونوارێن وی لسەر لەشێ وان دیاربوویە، ل ١٦ای نیسانا ١٩٨٧ێ، فروکێن جەنگی ێن عیراقێ بسەدان بۆمبێن کیمیاوی بسەر گوندێن (شێخ وەسانان و بالیسان و کانی بەرد و توتمە و زینێ، بیراوە و بالوکاوە) باراندن، هەر دوێ رۆژێدا زنجیرا چیایێن هەریر و کاردوخ ... هتد، ب فروکان کیمیا بارانکرن، سەدان قوربانی ژ بریندار و کوشتیان ژێ ڤێکەفتن، پرانیا قوربانیان ژ گوندێ شێخ وەسانان بوون، کو هیچ کەسەك ژ وان ب سلامەتی ژ ڤێ هێرشێ قورتال نەبوو.

رۆژ ب رۆژ بكارئینانا ئەڤی چەكێ ترسناك دزێدەبوونێدابوو، دقۆناغێن ئەنفالاندا گەهشتە گوپیتكا بكارئینانێ، رژێمێ بێی گیروبوون هەر بەرەڤانیەك یان ئاستەنگەك ل جهەكێ هاتبا بەرسنگێ سوپایێ ڕژێمێ ب چەكێ كیمیاوی چارەسەر دكر ئەگەرێ ڤێ ژی بۆ بێدەنكرنا كۆمەلگەهێ نیڤ دەولەتی و بێكەسیا گەلێ كورد و ڤەدەربوونا وی ل دەڤەرەكا دابڕیدا ڤەدگەریتە ڤە.



پەیكەرێ عومەرێ خاوەر و مۆنۆمێنتی شەهیدێن هەلەبچە

## كیمیا بارانكرنا بازێرێ هەلە پچە :

ژبەر ستراتیژیا جهێ جوگرافیێ وی بازێری، كو هەڤسنوورێ ئیرانێ یە و رێكەكا بازرگانییە و دیرۆكا دویر و درێژا بەرهنگاریكرنا ئاكنجیێن وی دژی زۆرداریا رژێما بەعس، نیشانا خوراگری و د مێرخاسیا ئاكنجیێن وێ بوویە، ئەڤان هۆكاران

وەل ڕژێما بەعس کر، پتر چاڤێ وی ل ئاکنجیێن ڤێ دەڤەرێ ببن. هەلەبچە ب تاگرێن نەیارێن ڕژێمێ دهاتە هژمارتن، ل دەستپێکا سالا ١٩٨٨ێ، دەمێ هێزا پێشمەرگەی شیای وی باژێری و دەوروبەران ژ دەستێ ڕژێمێ دەربێخیت، بۆ ڕژێمێ بۆ بەهانە بۆ درێژەپێدانا سیاسەتا ڤڕکرنا ڕەگەزێ گورد، هێرشەکا بەربەلاڤ کرە سەر وێ دەڤەرێ، وەك کارڤەدانەك ل هەمبەر هێرشا پێشمەرگێ کوردستانێ، دڤێ هەوێدا گەلەك ژ باژێر و باژێرکێن کوردستانێ کاڤلکرن، ئێك ژ ڤان باژێران هەلەبچە بوو. هەژی گوتنێ یە هەوێن کیمیا بارانا بۆ سەر هەلەبچە، پشکەك نەبوو ژ زنجیرێن هەوێن ئەنفالان بۆ ژناڤبرنا کوردان.

ل شەڤا (١٥-١٦/٣/١٩٨٨) تۆپ بارانکرنێ و کاتیوشێن دویرهاڤێژ بۆ ناڤ باژێری دەستپێکر.

خەلکەکێ زۆر درۆژێن بەری هینگێ دا باژێر بجهـ هێلابوو، چووبوونە دەرڤەی باژێری. سپێدەهیا ڕۆژا ١٦ی حەفت فروکێن جەنگی هاتنە سەر وی باژێری، ب موشەك و ناپالمان باژێر تۆپ بارانکر، کو هژمارەکا خەلکی کوشتن و گەلەك ئاڤاهی ژی کاڤلکرن. دوی دەمیدا پێ حەسیان کو دوژمنی مەرەمەکا خراب هەیە، لەورا داخاز ژ ئاکنجیێن باژێری هاتەکرن باژێری چولبکەن، بەلێ خەلکەکێ زۆر دباژێریدا مان، ژ ترسێن تۆپ بارانکرنێ خو دخانییێن خۆڤە ڤەشارتن. ئەو تۆپێن کو ل دەمژمێر یازدە باژێر پێ تۆپ بارانکری چەکێ کوژەکێ تێکەلبوو ژ تۆپێن مەزن و ئاسایی و ناپالم و کیمیاوی، لەورا بریار هاتە دان هەتا شەڤ دهێت ئەڤجا خەلکێ باژێری برەڤن، بەلێ فرۆکێن ڕژێمێ بەردەوام ل هنداڤ دەڤەرێ دهاتن و چوون و دەرفەت نە ددا خەلکی خۆ ڕزگار بکەن.



(١٦ى ئادارا ١٩٨٨) ل دەمێ تۆپ بارانكرنا هەلەپچە

دژوارترین تۆپ بارانكرنا كیمیاوى ل دەم ژمێر (٥،٢٠) ئێڤارى یا ١٦ى ئادارێ دەستپێكر، هەتا بەرى سپێدەهیا رۆژا ١٧ى ئادارێ، (١٤) جاران فروكا ب بەردەوامى باژێر تۆپ بارانكر.

دەرئەنجامێ ڤێ تۆپ بارانكرنا دژوارا و درندانە بوو ئەگەرێ كوشتنا پتر ژ (٥٠٠٠) پێنج هزار كەسان، ژ گەنج پیرو ژن و زارۆكان، هەروەسا برینداربوونا پتر ژ (١٠) دەهـ هزار كەسا و دەربەدەربوونا خەلكێ وێ دەڤەرێ بەرەف ئیرانێ و دەڤەرێن دى وەك سلێمانییێ و دەوروبەرێن وێ و كاڤلكرنا باژێرى ب تەمامى و كوشتنا هەر چ تەرش و كەوالێن دەڤەرێ هەبوو هەمى ڤڕكرن.



جهماییێن كیمیا بارانا هەلەبچە

ئەڤ هێرشا كو ل ناڤەراستا ئادارا ١٩٨٨ێ ب چەكێ كیمیاوی ژ لایێ سوپایێ عیراقێ ڤە سەر وەلاتییێن كورد دڤێجارێ، نەك بتنێ هێرشەكا گازا كوژەك و ژەهراوی و ترسیدار بوو دژی گەلێ كورد، بەلكۆ مەزنترین هێرش بوو ب گازا ژەهراوی پشتی جەنگێ ئێكێ یێ هاتییە ئەنجامدان.

# پرسيارێن پشكا چوارێ

**پ١/ ئەڤان زاراڤان پێناسە بكە:**

ناپالم، هەلەبچە، كۆمەلگەها ب زۆری (گوندێ كانێ)، شێخ وەسانان، گوركان و كۆمار، چەكێ كۆمكوژ.

**پ ٢/ هوییێن ئەڤان لێكبدە:**

١. ئەو كۆمەلگەهێن ب زۆری كو كورد و ئاشوری تێدابوون نێزیكی سنوورێ توركیا، كو ژ ترسا رژێمێ رەڤیبوون، مابوونە سەر سنوورێ توركیا.

٢. رژێمێ بێ ترس هەر بەرگرییەك یان ئاستەنگەك ل جهەكی هاتبا درێدا سوپایێ رژێمێ ب چەكێ كیمیاوی تۆپ باران دكر.

٣. رژێمێ ل ١٦ی ئادارا ١٩٨٨ ێ ب چەكێ كیمیاوی هێرشەكا بەربەلاڤ كرە سەر باژێرێ هەلەبچە.

## پشکا پێنجێ

### ئەنفال

تاوانا ئەنفالان ئێکە ژ مەزنترین و مەترسیدارترین وان تاوانێن کو ل دیماهیێن سەدێ بیستێ هەمبەر گەلێ کورد هاتیە ئەنجامدان، نویترین سیاسەتا ڕەگەز پەرستیانە بوویە بۆ قڕکرنانەتەوەکی لسەر جهێ باب و باپیرێن وی.



### تێگەهێ ئەنفالا :

ئەنفال پەیڤەکا عەرەبییە و ژ کۆمکرنا پەیڤا (نفل) هاتییە، کو ب زمانێ کوردی رامانا دەسکەفت ددەت ناڤێ سورەتا هەشتێ دقورئانا پیرۆزدا، ب رامانا وان دەستکەفتا دهێت کو ل دەمێ شەریدا بدەست لەشکەرێن موسلمان دکەڤن. ئانکو سەروسامانێن بێ باوەران کو بدەست موسلمانا دکەڤیت. ب ڤێ چەندێ بۆچوونێن

زانایێن ئیسلامی دەربارەی تێگەهـ و ڕامانا ئەنفالێ ئەڤەنە ((الانفال هو الغنيمة، أي كل نيل ناله المسلمون من أهل الحرب)). ئانکو ئەنفال دئایینێ ئیسلامێدا ئەو دەسکەفت و سامانە کو موسلمان ژ بت پەرست و بێ باوەران وەك دەسکەفتێن شەری ب دەست وان دکەڤیت، هەروەکی دسورەتا (الانفال) یا قورئانا پیرۆز دا هاتیە کرن: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (١ الانفال)، هەروەسا بڤی رەنگی بەحسێ چاواتیا دابەشکرنا دەسکەفتان دکەت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (٤١ الانفال).

## ئەگەرێ هاتنەخارا سورەتا ئەنفال:

ئەگەر ئەم ل ئەگەرێ هاتنە خارا ڤێ سورەتێ بگەرین، ب دروستی دێ تێگەهی ئەنفالێ بۆ مە رونبیتن.

**هوگرەکێ پێغەمبەری (س.خ) کو ناڤێ وی (عبادێ کوڕێ صامت) ڤەدگێریتن:**

(دگەل پێغەمبەری (س.خ) چووینە شەرێ (بەدر)ێ و کەفتینە بەرامبەر بێباوەران. دوژمن هاتە شکاندن، کۆمەکا موسلمانا بدویف کەتن، بۆ هندێ پتر بشکێنن، هندەکێن دی دەوروبەرێن پێغەمبەری (س.خ) گرتن، دا زیان نەگەهیتێ و کۆمەکا دی بدویف وان دەستکەفت و پاشماییێن کو بێباوەران لدویف خۆ بجهـ

هێلاین. ب ڤی رەنگی موسلمان بوونە سێ پشك. پشتی راهێلانا دوژمنی ڤەگەریانەڤە، وان داخازا دەسکەفت هەمی بۆ وان بن، چونکی ئەوان دوژمنێ خۆ شکاندییە. ئەوێن کو ل دەوروبەرێن پێغەمبەری (س.خ) ماین ب مافێ خۆ دزانی کو دەسکەفت بۆ وان بیت، ژبەر کو وان پێغەمبەر (س.خ) ژ مەترسییێ پاراستییە. بەلێ ئەوێن دەست بسەر دەسکەفتاندا گرتی رژدبوون لسەر هندێ کو وابخۆ دەسکەفتێن خۆ کومکرینە، بتنێ مافێ وان بخۆیە ببەن ژ ئەنجامێ ڤێ ڤەکێشێ لبەر ئاریشە دناڤبەرا واندا. خودایێ مەزن بۆ چارەسەرکرنا ڤێ ئارێشێ، ئایەتا ئەنفالێ ئینا خارێ.

## ئەنفال لە دیدی ئایینی ئیسلامێڤە :

وەکی ل بابەتێ بەراهیێ ئاماژ پێ هاتیەکرن، بۆ چارەسەرکرنا وێ ئارێشا کو دناڤبەرا شەرکەرێن موسلماناندا روویدای، د دابەشکرنا دەسکەفتێن شەرێ (بەدر)ێ دا، لەورا دشێین دەربارەی ئەنفالێ د لێنێرینا ئیسلامی ب ڤی شێوەی رێکبێخین:

١. ئەنفال ب رامانا وان دەسکەفتان دهێت، کو جەنگاوەرێن موسلمانا دەمێ شەریدا دگەل بن پەرستان و بێباوەران ژ مال و سەروسامان و تەرش و کەوال و ئێخسیرێن جەنگی بدەستکەڤتێن.

٢. ئەو لایەنێن کو دەسکەفتان ژێ وەردگرن، دڤێت کۆمەکا بێباوەر و کافر بن، ژ لایێ وان موسلمانان کۆ مەرەما وان ژ شەرکرنێ سەرئێخستنا ئایینێ ئیسلامێ بوویە، نەك کەسێن بێ گونەهـ.

ئەگەر هەڤبەرکرنەکێ دناڤبەرا ئەنفالا رژێمێ و بنەمایێن ئەنفالێدا بکەین، ب چ رەنگا ئێکدوو ناگونجن، چونکی گەلێ کورد مللەتەکێ موسلمانە و باوەردارە. ل دەسپێکا بەلاڤبوونا ئایینێ ئیسلامێ ب حەزا خۆ بووینە موسلمان، هەتا نهۆ ژ نەتەوێن ئێکا نەیە کو ب دروستی ئایینێ ئیسلامی پەیرەو دکەن، هەروەسا کورد لسەر ئاخ و ناڤ مالا خۆ هێرش ئینانە سەر، ب دربێ هێزێ تالانکریە و ژ گوندێن وان بەرەڤ جهێن نە دیار برن و گوللە بارانکرینە و ب ساخی بن ئاخکرینە.

## پێناسا ئەنفالێ:

وەکی مە ل بابەتێ بەراهیێ بەحسکری، هەر ل دەسپێکا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ کورد تووشی ڤرکرنا نەژادی بوون، ب هەمی شێوێن گرتن و راگواستن و تالانکرن و ب عەرەبکرنێ، بەلێ ئەوا ل سالا ١٩٨٨ز ب ناڤێ ئەنفالێ ل هەمبەر گەلێ کوردستانێ هاتیە ئەنجامدان، شێوەیەکێ تایبەتی وەرگرت، ژ درندیێ و ڤرکرنێ، کو دشێن ب رەنگەکێ جینۆسایدا ترسناك دڤی سەردەمیدا بۆ مرۆڤاتیێ بدەینە نیاسین. ئانکو دشێین (ئەنفالێ) ب ڤی شێوەی پێناسە بکەین، کو (میدل ئیست وۆچ)، بەرچاڤ دکەت: **(ئەنفال ئەو ناڤبوو کو ب زنجیرەکا هێرش و پەلامارێن سەربازی کو نەخشە بۆ دانابوو هاتنە ئەنجامدان. سەرجەم هەشت هێرش بوون ل شەش دەڤەرێن جوگرافی یێن جوداجودا برێڤەچوو، ل ناڤبەرا هەیڤا شواتێ و دەسپێکا ئەیلولا ١٩٨٨ز)** ل دەسپێکێ کریارێن سەربازی ددەستێ نڤیسینگەها باکوور یا رێکخستنا حزبا بەعسیدابوو، کو بنگەهێ وێ یێ سەرەکی ل باژێرێ کەرکووکێ بوو. ل ئادارا ێ وەرە ژ لایێ (علي حسن المجيد) (علي كيمياوى) ڤە،

سەروکاتیا وێ دهاتەکرن. هێرش و بەلامارێن ئەنفالێ ژ لایێ هێزێن نیزامی و هەردوو فەیلەقێن ئێك و پێنج هاتنە ئەنجامدان ب پشتەڤانیا یەکێن جوداجودا یێن سوپایێ عیراقێ و فەوجێن سڤکێن کوردان (جاشی).



(ڕێورەسمێن دووبارە ڤەشارتنا ئەنفالکرییێن گەرمیان)

ئەنفال بەرچاڤترین تاوانە کو پشتی شەڕێ جیهانیێ دووێ دا بسەر گەلێ کوردادا هاتی، ژبۆ ژناڤبرن و بنبڕکرنا بزاڤا نەتەوەیا کورد و نەهێلانا هەمی نیشانێن نەتەوەیی و کەلتۆری و دیرۆکی و دیموگرافی و جڤاکی و ئابووری و .... هتد.

هێرشێن ئەنفالێ ب ژ دژوارترین دیاردێن پێشیکرنا مافێن مرۆڤی ژ لایێ ڕژێما عیراقێ ڤە دهێتە دانان، کو پەلامارێن سەربازی ئێکسەر گوند و چەند باژێرکێن کوردستانێ ب تەمامی وێرانکرن و هژمارەکا زۆر ژ ئاکنجییێن بێ گونەهـ بۆ چەند جهەکێن تایبەت ڕاگواستن، ل بیابانێن رۆژئاڤا یا عیراقێ، لسەر توخیبێ عیراق -

سعودیە، کو پڕانیا هەوا زۆر ژ وان ل ڤێ دەڤەرێ ب ساخی بن ئاخدکرن و هندژی گولله بارانکرن و مال و سەروسامایێن وان ژی وەك دەسکەفتێن شەڕی ب تالان برن.

دەسهەلاتدارێن ڕژێما بەری نهۆ یا عیراقێ گەلەك ب شانازیڤە دانپێدان ب هێرشێن ئەنفالێ کر. هەر سالێ ژی بیرەوەریا وێ ساخدکرەڤە، بەلێ چ جارا دانپێدان ب بێسەروشوینکرنا وان دەهـ هزار مرۆڤێن بێ گونەهـ نەکریە. زەلامێن رژێمێ وەسا بەلاڤەدکر، کو هەوێن ئەنفالێ بتنێ دژی (تێکدەران و کرێگرتیان) هاتینە کرن.

## هۆکارێن ئە نجامدانا هەوێن ئەنفالێ:

هۆکارێن ئەنجامدانا هەوێن ئەنفالێ بۆ ژناڤبرن و قڕکرنا گەلێ کورد، ئەڤێن خارێنە:

**ئێك:** گرنگییا جهێ جوگرافی یا هەرێما کوردستانێ، ئەڤی جهی گرنگییا تایبەت یا جیۆپولتیکی هەیە، کو پویتەی ب دوو بنەماێن سەرەکی (سروشتی و مرۆڤی) ددەت، ل ئەنجامێ لێکدانا هەردوو بنەما، بنەمایێ ئابووری ژی پەیدادبیت.

### أ. بنەمایێ سروشتی:

کوردستان بسەر (٤) چار دەولەتێن دەڤەرێ هاتیە دابەشکرن ئەو دەولەت ژی هەمی دەما دململانێدابوون دگەل ئێکدوو. هەرچەندە جهێ جوگرافی لسەر ئەردی نەگورە، بەلێ ژ لایێ جیۆپولتیکیڤە ژ دەمەکی بۆ دەمەکێ دی ژبەر باندۆرا

هۆکـارێن ئـابووری و سیاسـی دهێتـە گوهـوڕین، هـەرێما کوردسـتانێ دکەڤیتـە دناڤبـەرا هەرچـار دەولـەتێن (عیـراق، ئیـران، تورکیـا، سـوریا)، لـەورا وەلێهاتیـە هەردەم کێشا وێ ئالۆزبیت و دەنگێ رەوایـێ گـەلێ وێ نەگەهیتـە جیهانـا دەرڤـە. هەرێما کوردستانێ گرنگیێن زۆر هەنە کو پێکهاتینە ژ:

١. دەڤەرەکا دەولمەندە ب پترول و غازا سروشتی و سامانێن کانزاییێن دی.

٢. ئاخەکا ب زاخ و ژێدەرێ ئاڤەکا زۆر، وەکریە ببیتەی ئەگەرێ هەبوونا هەمی جۆرێن دەرامەتێ چاندنێ، کو شیاندایە ب سەلکا خوارنا عیراقی بهێتە دانان و کاریگەریا وێ لسەر ئاساییشا خوارنا هەمی عیراقێ هەبیت.

گرنگیا جیۆپولتیکی یا هەرێما کوردستانێ، ب هۆکارەکێ گرنگك و سەرەکی دهێتە هژمارتن بۆ ئەنجامدانا ڤێ تاوانێ، چونکی ئەگەر عیراقێ هـەرێما کوردسـتانێ ژێ جودابیت دێ بیتە وەلاتەکێ هەژار و کێم ئـاڤ و کـێم دەرامـەتێ خورسـت. ئـانکو کوردستان مەرجێ بهێزبوونا دەولەتا عیراقێیە.

## ب. بنەمایێ مرۆڤی:

هژمارا ئاکنجییان گرنگییەکا زۆر هەیە دپیڤەرێ بهێزکرنـێ و لاوازیـا دەولەتێـدا ل دیموگرافییـا هـەرێما کوردسـتانێ، ئەگـەر تەماشـەی ئـاکنجێن وێ بکـەین لسـەر ژمێریا گشتی یا عیراقـێ، ڕێـژا ژ دایکبـوونێ، ل ڤـێ هـەرێمێ پتـرە ب هەڤبـەرکرن دگەل ناڤەر است و باشوورێ عیراقێ ڕێژا مرنـێ ژی کێمترە، ژبەر کاریگەریا ئاف و هەوایێ وێ و تایبەتمەندییا ژنا کورد کو ب (زاك) ترە (خصوبة). ئەڤـەژی ب ئێـك هۆکارێن دیموگرافیێ دهێتە دانان بۆ گەلێ کورد. هەر ژبەر ڤی ئەگـەرێ ژی ڕژێما

عیراقێ ژ رووییێ ئاسایيشا نەتەوەییڤە هزر تێدا کریە و نەخشە دارشتییە بۆ ژناڤبرنا تەخا گەنجێن کورد، کو ب ئەنجامدانا هەوێن ئەنفالا ب هزاران زەلام و ژنێن گەنجێن کوردان ژناڤبرن.

**دوو:** تێکچوونا هەڤسەنگییا تەمەنی دناڤبەرا گەنجێن کورد و گەنجێن ناڤەراست و باشووری عیراقێ.

شەڕێ درێژڤەکێشێ ناڤبەرا عیراقێ و ئیرانێ بوویە ئەگەرێ ژناڤبرنا هزارەکا گەنجان دبەروکێن شەڕیدا، ب تایبەتی گەنجێن ناڤەراست و باشووری عیراقێ کو شوینوارێن خرابێن (ئابووری و کۆمەلایەتی و سوپای) لسەر جڤاکێ عیراقێ هەبوویە.

**سێ:** دەڤەرەکا زۆرا کوردستانێ دبن دەسهەلاتا هێزا پێشمەرگێ کوردستانێدا بوو، ب تایبەتی دەڤەرێن چیایێن ئاسێ، کو بۆ بەرهنگارییێ و شەڕی دبەرژەوەندیا پێشمەرگەیدا بوو. حکومەتا عیراقێ ژی ب مانەکێ یاسێییێ خو دزانی، کو دووبارە ئەڤان دەڤەران بێخیتەبن دەسهەلاتا خۆ، سوپایێ عیراقێ ژی دوی دەمیدا مژویلی بەروکێن جەنگێ ئیرانی بوو، نەدشیا ب ئازادی رووی ب رووی ئیرانێ ببیتن، ژبەر گورزێن کوژەکێن پێشمەرگەی. لەورا هەوێن ئەنفالێ پتر گوندێن کوردستانێ ڤەگرت، چونکی ب ژێدەرەکێ سەرەکی یێ ژین و ژیارا ئاکنجیێن وێ جهێ ڤەحەواندنا هێزا پێشمەرگەی دزانی.

**چوار:** ل دەستپێکا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ، حکومەتێن ئێك لدویف ئێکێن عیراقێ نەتەوا کورد وەکو ئاستەنگ و رێگر ل بەردەم ئێکەتیا نەتەوەیا عەرەب ددانا. ب هزر و بۆ چوونا سیاسەتڤانێن عیراقێ کێشا کورد مەترسییە لسەر ئاساییشا نەتەوا عەرەب، لەورا هندی وان پێچێبووی هەمی هەولێن داین ژبۆ حەلاندن و ژناڤبرنا ئەڤێ مەترسییێ، هەوێن ئەنفالێژی ب تۆلا هەولێن ڤرکرنا نەژادێ گەلێ کورد ل عیراقێ دهێتە دانان.

**پێنجەم:** پەیوەندیێن نیڤ دەولەتی و هەرێمێن عیراقێ.

حکومەتا عیراقێ ل سالێن هەشتێیێن سەدێ بیستێ، وەلاتەکێ دابری نەبوو ژ روویێ پەیوەندیێن نیڤ دەولەتی و هەرێمی ڤە، بەلکو پەیوەندییەکا موکم دگەل وەلاتێن عەرەبی و جیهانیدا هەبوو، لەورا ژ لایێ سەربازیڤە دماوێ جەنگێ هەشت سالی دگەل ئیرانێ ببۆ وەلاتەکێ بهێز ل وێ دەڤەرێ. پشتەڤانیا دەرڤە و جیهانێ وەل حکومەتا عیراقێ کربوو، کو گوهـ نەدەتە هیچ یاسا و بریارەکا نیڤدەولەتی دپەیرەوکرنا سیاسەتەکا وێرانکارانەدا دژی دەڤەرێن کوردستانی. بۆ نموونە، دەمێ حکومەتا عیراقی بوێ بەرفرەهیێ و دژواریێ چەکێ کیمیاوی د هەوێن ئەنفالیدا بکاردئینا، حکومەتا سوڤیەتی داکوکی ل هەلویستێ عیراقێ دکر. ژبلی ڤێ ژی حکومەتا تورکیا رۆلەکێ گرنگك دگێرا دڤی بیاڤیدا، ئاخفتنکەرێ وەزارەتا دەرڤە یا تورکیا راگەهاند، کو شارەزایێن نوژداری یێن تورکیا پشکنینا پەناهندێن کوردان کریە، هیچ شینوارێن چەکێ کیمیاوی لسەر وان دیارنەبوو، هەروەسا ب

داخازیا نەتەوێن ئێکگرتی رازی نەبوو، بۆ هنارتنا بسپۆرێن ساخلەمیێ بۆ پشکنینا پەناهندێن کورد.

**شەش:** تێکچوونا بارودۆخێن کوردان، کورد د ڤێ قۆناغێدا زۆر دبێ کەس بوون، چ هێز و وڵاتەك نەبوو پشتەڤانی و داکوکیێ ل مافێن وی بکەت و گڤاشتنێ بێخیتە سەر حکومەتا عیرقێ بەرامبەر هەمی پێشێلکاریێن نەمرۆڤانەیێن کو پەیرەو دکر دقڕکرنا ڕەگەزی دژی گەلێ کورد، ب تایبەتی ل سالا ١٩٨٨ کو هەمی دەڤەرێن کوردستانێ ڤەگرت.



(کۆمکرنا ژن و زارۆکێن کورد د هەوێن ئەنفالێدا و رەوانەکرنا وان بەرەف مرنێ)




(نەخشێ ژمارە (٥) دەڤەرێن ئەنفالکریێن هەرێما کوردستانێ)*

---

* ژ نەخشێن سەردار محمد عبدالرحمن / ئەتلەسا هەرێما کوردستانا عیراقێ

## هەوێن ئەنفالا

### ١. جوگرافیا هەوێن ئەنفالا

وەکی ل بەراهیێ ئاماژە پێکری، سەرێن عیراقێ هەر ژ دەستپێکا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ، بەردەوام بوون لسەر سیاسەتا قڕکرنا رەگەزێ کورد، چونکی دهزرا وان یا نەتەوە پەرێس دا، کورد مەترسی بوون لسەر ئاساییشا نەتەوێ عەرەب، لەورا رۆژ بۆ رۆژێ تاوانێن وان مەزنتر لێ دهاتن و زیانێن گەلێ کورد ژی ب هەمان شێوە مەزنتر دبوون، هەتا سالا ١٩٨٨ رژێمێ هەر چ هێز و شیان و تەکنۆلۆجیا و پەیوەندیێن نیف دەولەتی بدەستخۆ ئێخستین هەمبەر گەلێ کورد بکارئینایە، لێ ئەڤێ جارێ ل ژێر ناڤێ (ئەنفال)ێ تاوانێن خۆ ژی ب چەند قۆناغەکا دەستپێکر و پێکهاتینە ژ:

**ئەنفالا ئێکێ: ئەنفالا دۆلا جافایەتی، ل (٢٣ شواتێ هەتا ١٩ی ئادارا ١٩٨٨ێ ڤەکێشا ).** ئەڤ هەوە ب هێرشکرنا بۆ سەر گوندێن سەرگەلۆ و بەرگەلۆ یێن دۆلا جافایەتی ل ٢٣ شواتا ١٩٨٨ێ دەستپێکر. ژ چەند لایانڤە ب درێژیيا (٨٠) کم ژ بنگردێ بۆ لایێ رۆژهەلاتا دەریا چادوکان و باژێرکێ دوکان، ژ وێرێ ژی بۆ باژێرێ سلێمانیێ و باژێرکێ داوەت و چوارتا ڤەگرت. ئارمانجا ڤێ هێرشێ ژناڤبرن و کاڤلکرن (٢٥ - ٣٠) گوندێن دۆلا جافایەتی و داگیرکرنا بارەگایێن سەرکردایەتییا هێزا پێشمەرگەی بوو ل ڤێ دەڤەرێ. ئەڤ هێرشا بەربەلاڤ سنوورێ باژێرکێن (سورداش، دوکان، بنگرد، سەرچنار، قەلاچولان و چوارتا) ڤەگرت. بسەرپەرشتیا وەزیرێ بەرگری (سولتان هاشم)ی بوو. هێزێن پشکدارێن ڤێ هەو پێکهاتبوو ژ

(٢٠) ليوا و شێست فەوج و ب دەهان فەوجێن جاشێن خۆفروش و مەفرەزێن تايبەت، ب نويترين چەكێ گران و ب دژوارترين چەكێ كيمياوى دڤێ هێرشێدا هاتە بكارئينان، دئەنجامدا چەندين گوند و دەڤەر وێرانكرن. بۆ نموونە (قەمچۆغە، شاخەرەش، قزلەر، قرەسەرد، ئاسۆس، قەرەچەتان، شەدەلە، پيرەكەگرون، زێوێ، گەردێ، دابان، مەرگە و شارستێن)، هەروەسا كانى توو، ياخسەمەڕە، قەيوان ... هتد. ب شێوەيەكى چ گوند ل ڤێ دەڤەرێ رزگارنەبوو. ل دوماهيا ڤێ هەوێ هەمى ئەو دەڤەر هاتنە داگيركرن و گشت گوند هاتنە كاڤلكرن و وێرانكرن و مال و سەروسامانێ وان ژى ژ لايێ سوپايێ عيراقێ ڤە هاتە تالانكرن. دەمێ گوند هاتينە داگيركرن، ئاكنجيێن وێ دەڤەرێ بەرەڤ ئيرانێ رەڤين، هندەك ژى بەرەڤ سلێمانيێ چوون، لەورا گونديێن دۆلا جافايەتى پشكەكا زۆرا وان دەربازبوون. بەلێ ئەوێن بەرەڤ ئيرانێ رەڤين ژبەر سەرمايێ و بەفر و بارانا پرانيا وان ب رێكێڤە مرن. ئەو خەلكێ كو ماين و دەرباز نەبووين هەمى گرتن و بەرزەكرن.

## ئەنفالا دووێ: ژ ( ٢٢ ئدارێ هەتا ١ نيسانا ١٩٨٨ ب دوماهى هات )

ئەڤێ هێرشێ دەڤەرا قەرەداغ ڤەگرت ل (تەكيە، سێوسێنان، سەگرمە، دەربەندباسەڕە، قەرەداغ.... هتد) گشت گوند و ئاڤەدانيێن ڤێ دەڤەرا جوگرافى ڤەگرتن. دەستپێكا ڤێ هێرشێ ب كيميا بارانكرنا چەند جهەكێن ستراتيژى ل وێ دەڤەرێ دەستپێكر، لەورا گوندێ سێوسێنان كو گوندەكێ ديارى وێ دەڤەرێ بوو ب ڕەنگەكێ زۆر سەخت و دژوار كيميا بارانكر. مەرەم ژ ڤێ كريارێ شكاندنا ورەيێن

خەلکێ دەڤەرێ بوو. ل دەمێ وێ هێرشێ ئاکنجێن دەڤەرا قەرەداغ ب دوو رەخانڤە رەڤین، هندەك ژ وان بەرەف سلێمانییێ و ئۆردیگاییێن دەڤەرا سلێمانییێ دەڤەرا سلێمانییێ چوون، زیانا وان یا کێم بوو، بەلێ ئەوێن بەرەف ژێرییا گەرمیان رەڤین هژمارەکا زۆرا وان هاتنە دەستەسەرکرن و پاشی بەرزەکرن.

ل ئەنفالا قەرەداغ ئەو هەڤوەلاتیێن کوردێن کو هاتینە گرتن یان خۆ داینە دەست، بۆ سەربازگەها قۆڕەتو و راگوهاستن، کو نێزیکی هەشت هزار کەسان بوون ژ زارۆك و ژن وگەنج وپیران، پاشی ڤەگوهاستن بۆ سەربازگەها تۆبزاوا نێزیکی کەرکووکێ. ئەڤجا ل وێرێ گەنجێن وان ژ یێن دی جوداکرن و بەرەف جهێن نەدیار رەوانەکرن، خەلکێ دی ژ ژن و زارۆك و کچێن زوگورد ئێخستنە دزینداناڤە بەلێ پیرەژن و پیرەمێر بۆ (نۆگرەسەلمان) ل بیابانا سەماوە ڤەگوهاستن، کو ل وێرێ هژمارەکا ئێکجار زۆر ژ برس و تێهن نە خوشیاندا مرن و تەرمێن وان هاڤێتنە دەرڤەی وێ زیندانێ، سەیان دخوارن.

## ئەنفالا سێیێ: (ژ ٧ هەتا ٢٠ێ نیسانا ١٩٨٨)

ئەوا ئەنفالا سێیێ کو دەڤەرا گەرمیان ڤەگرت، مەزنترین و بەرفرەهترین هێرش بوو ل سالا ١٩٨٨ بۆ سەر کوردستانێ، کو دەڤەرێن (دوز، قادر کەرەم، کەلار، کفری، چەمچەمال، تێلەکۆ، پێباز، سەنگاو، تەکیە و پشکەك ژ دەڤەرا ئاغجەلەر) رامالین. زیانەکا گیانی و مالی یا ئێکجار مەزن ب ئاکنجییێن نێزیکی (٥٠٠) پێنج سەد گوندێن ڤێ دەڤەرێ کەفت، کو پتر ژ (٣٠) سیهـ هزاران ژن و زارۆك و پیر و گەنجان بێسەر وشوینکرن و مال و سەروسامانێ وان ژێ هاتە تالانکرن.

ل (١٤ى نيسانا ١٩٨٨)، چار باژێركێن گەرميان ب ئێك رۆژ ب تەمامى هاتنە ويرانكرن و نێزيكى (٢٠) بيست هزار ژن و زارۆك و زەلام بۆ سەربازگەهێ قۆرەتوو رەوانەكرن، لەورا ئەڤ رۆژە ل هەر سالەكێ كريە رۆژا ساخكرنا بيرەوەرييا تاوانێن مەزنێن ئەنفالێ ل كوردستانێ.

ئەگەرێ زۆريا هژمارا گرتى و بەرزەكرييێن گەرميان، ڤەدگەرێتە بۆ هندێ كو پارێزگەهێ سلێمانييێ دگەل قائيمقامێ چەمچەمال ب رێكا مستەشارێن كورد پرۆپاكندە بەلاڤكرن، كو حكومەت هەر خێزانەكێ دێ بۆ (٣٠٠) مەترێن دوجارى يێن ئەردى دگەل (ڤەرێن ئاڤاكرنێ) (سلفة العقار) دەتە ئاكنجييێن گوندان. ئەڤێ ژى وەكر، كو ئەو خەلك ئارام ببيت و نەرەڤن، لەورا ئەڤ هژمارا زۆر هاتنە دەستەسەركرن.



(وێرانكرنا (كاڤلكرنا) گوندێن كوردستانێ ل دەمێ ئەنفالێ)

دەستەسەرکرییێن ئەڤی بنگەهی بەرەف چەمچەمال هاتنە رەوانەکرن، کو کەمپێن قادر کەرەم و لەیلان بوون بۆ وێرێ دهنارتن. بەلێ گرتییێن باشوورێ گەرمیان د دوو بنگەهێن سەرەکی کۆمکرن، ئێك ژ وان بنگەهێ لاوێن دوزخورماتو بوو، کو نێزیکی چار هزار کەسان تێدا زیندانکربوون، ئەشکەنجەدان و برسیکرن و تێهنیکرنێ، هەرچ پارە و زێر و تشتێ ب بها ژ ئافرەتێن وان دستاندن. دگوتە وان هەوە هاریکاریا (موخەریبان) پێشمەرگە کرییە. بەلێ بنگەهێ دووێ بۆ کۆمکرنا گرتییان، بارەگایێ فرقا (٢١) بوو ل قۆرەتوو. ژ زاردەڤێ ئێك ژ قورتالبوویا هاتییە، کو نێزیکی (١٠) دەهـ هزار کەسان دڤێ کەلها سەربازیدا زیندانکربوون.

ل دویف چاڤپێکەفتنێن (MEW میدل وێست ووچ)، دگەل ئێك ژ رزگاربوویان، ژن و زەلام هاتنە ژێك جوداکرن، ئەڤجا زەلام بۆ جهەکێ نەدیار ڤەگوهاستن وپاشی ژێ ب هەمان شێوە ژن و زارۆکێن وان جوداکرن.

## ئەنفالا چوارێ: ئاڤزێلا زێ یێ بچویك (ل ٨ ێ نیسانێ هەتا ٣ێ گولانا ١٩٨٨ ێ).

هێزێن رژێمێ پشتی تەمامکرنا تاوانێن ئەنفالا سێیێ، کو پترین هژمارا قوربانی و بێ سەروشوینان ژێ پەیدابوو. دهێرشێن خودا یا بەردەوامبوو بۆ سەر دەڤەرێن دیێن کوردستانێ ب هەمان شێوە.

جوگرافیا ئەڤێ هەوێ ئاڤزێلا زێ یێ بچویك بوو، کو هێلا سنووری هەردوو پارێزگەهێن کەرکوك و هەولێر دگەهینیتە ئێك. ئەڤ ئاڤزێلە، باژێرکێن (رێدار،

ئاغجەلەر، تەقتەق و چەند گوندەکێن مەزن وەکی عەسکەر و گۆپیتەپە ڤەدگریت)، کو دشێین بێژین سنووریٚ ئەڤیٚ هەویٚ دەڤەرێن دەشتا کۆیە و تەقتەق و شێخ بزێنیٚ و ناوشوان و ئاغجەلەر و خالخالان و چەمیٚ رێزان ڤەگرتییە.

دەسپێکا ئەنفالا چواریٚ ب کیمیارانکرنا گوندیٚ گۆپتەپە ل رۆژا ٣ی گولانا ١٩٨٨یٚ دەستپێکریە ب رێکا فروکێن جەنگی توپێن کیمیاوی بسەر خەلکیٚ وێدا باراندن، قوربانیێن ڤی گوندی ب نێزیکی (٣٠٠) کەسان دهێتە خەملاندن، هەردوی دەمیدا گوندیٚ عەسکەری ب هەشت تۆپێن کیمیاوی تۆپ بارنکر، بێهنا کیمیاییٚ بەلاڤەبوو و گەهشتە گوندیٚ حیدەربەگک، ل وێریٚ ژی هژمارەکا قوربانیان ژیٚ پەیدابوو.

ژ بۆ ڕێگرتن ژ دەربازبوونا ئاکنجیێن گوندێن گۆپتەپە و عەسکەر و حەیدەربەگیٚ، ئاڤا سکریٚ دوکان بەردا، هەتا کو نەشێن ژ وی زێی دەربازبن و رزگار ببن. ئەو خەلك بەرەف دەڤەرێن چەمچەمال و تەکیە و هندەك ژی ژ وان بەرئاف خۆ بەردانە خوار و بەرەف دەڤەرا شێخ بزێنیٚ چوون. ئەو خەلکیٚ رەڤین ژ گوندیٚ عەسکەر لسەر جاددا سەرەکی ژ لاییٚ سوپای و جاشان ڤە هاتنە دەستەسەرکرن و رەوانەی کۆمەلگەها سوسیٚ کرن. ب ڤی رەنگی پڕانیا خەلکیٚ ویٚ دەڤەریٚ، ژ دەستیٚ سوپای رزگارنەبوون هاتنە بێسەروشونکرن. ل ٤ی گولانیٚ ئەو هێرش یا بەرفرەهتربوو ب شێوەکی دەڤەرێن دەوروبەرێن باژێریٚ کۆیە و گوندێن رەخ و ڕوویێن زیٚ و دەوروبەرێن باژێرکیٚ تەقتەق و دەڤەرا شێخ بزێنیٚ ڤەگرتییە. ب درێژیا زێییٚ بچویك سوپای گوندێن ڤی لای و لاییٚ دی. سوتن و وێرانکرن. هژمارا بێسەروشوینێن ڤیٚ دەڤەریٚ گەهشتە (١٦٨٠) هزار و شەش سەد و هەشتیٚ کەسان. ب

ڤی رەنگی، درندیا رژێمێ هەمی گوند و دەڤەر ڤەگرتن، کو (٢٣٧) دوو سەد و سیهـ و حەفت گوند سوتن و راستکرن و وێرانکرن، نێزیکی (٢٥٠٠) دوو هزار و پێنج سەد کەسان ل دەشتا کۆیە (٣٠٠٠) سێ هزار کەس ل دەڤەرێن شێخ بزێنێ و ناوشوان بێسەروشوینکرن. دڤێ هەوێدا هەمان سیاسەتا ئەنفالێن دی هاتە پەیرەوکرن ژبۆ کۆمکرنا ئەوی خەلکێ هاتیە گرتن، کو چەند جهـ بەرهەڤکرن بۆ کۆمکرنا وی خەلکی و ڤەگوهاستنا وان بۆ جهێن نەدیار.

## ڤوناغا ئەنفالێن (٥،٦،٧) (دۆلا چیایێن شەقلاوە و رەواندز ژ ١٥ی گولانێ – ٢٦ێ تەباخا ١٩٨٨ ێ):

دەستپێکا ڤێ هێرشێ کو ل ١٥ی گولانا ١٩٨٨ێ بوو، رۆژا دوماهیێ یا هەیڤا رەمەزانێ بوو. چەند فروکەك کەفتنە کیمیا بارانکرنا گوندێن (وەرە، نازەلین، کاموسەك، ئەسپیندارە، عەلیاوە، سماقولێ)، بوویە ئەگەرێ گییان ژ دەستدانا هژمارەکا زۆرا ئاکنجیێن گوندان و مراربوونا تەرش و کەوالێ وان. توندوتژوارترین هێرشا سوپایێ عیراقێ، بۆ دەڤەرا دولا پالیسان بوو، بەلێ زیانێن گیانی ب هەڤبەرکرن دگەل هێرشێن بەری هینگی گەلەك کێمتر بوون، چونکی پرانیا دەڤەرێن سنووری یێن پارێزگەها هەولێرێ ل سالێن

(١٩٧٧ - ١٩٧٨)ێ و (١٩٨٣ - ١٩٨٤)ێ هاتبوونە چۆلکرن و خەلکێ وان ڤەگوهاستبوونە کۆمەلگەهێن ب زۆری، بەلێ هندەك گوند مابوون، ب تایبەتی گوندێن ئازادکرییێن دەڤەرێن سەخت و ئاسێ، کو دەستێ سوپایێ عیراقێ نەدگەهشتێ، ژبەر بەرگریا پێشمەرگەی و ئاسێبوونا دەڤەرێ، ل ٢٣ گولانێ گوندێن بالیسان و هیران و دۆلێن

دەوروبەر چەند جاران ب گرانی هاتنە کیمیا بارانکرن و ٢٢ - ٢٣ێ هەمان هەیڤدا گوندێ وەرتێ هاتە کیمیا بارانکرن. لایەکێ دی ژ سەروچاوە و بەنی هەریر و خەلیفان ب شێوێ بازنەیی بوو، نێزیکی (٧٢٠) حەفت سەد و بیست خێزان دەربدەرکرن و مالێ وان هاتە تالانکرن. مەزنترین زیان ل ڤێ دەڤەرێ بەر گوندێ (بلەی خواروو) کەفت، خەلکێ توبزاوا کەرکووکێ رەوانەکرن و ل وێرێ ژن و زەلام و گەنج ژێك جوداکرن و گەنج بەرزەکرن. ل رۆژا ٧ی خزیرانێ هەوێن ئەنفالا پێنجێ بدوماهی هات.

دەستپێکا ئەنفالا شەشێ ل ٢٦ی تیرمەهێ ب تۆپ بارانکرنا دەڤەرێن دۆلا بالیسان و دۆلا مەلەکان و دۆلا وەرتێ و دۆلا هیران و سماقولێ ب چەکێ کیمیاوی دەستپێکر و خەلکێ وان تەرابەرا کر، پاشی ژ لایێ جاشان ڤە ئەو دەڤەر هاتە داگیرکرن، داخاز ژ خەلکی کر خوبدەنە دەستێ وان، لێبورینا گشتی هەیە، لەورا هژمارەکا زۆرا وی خەلکی هاتە خاپاندن، خۆ بدەستڤە بەردا، ئاگەهداریا وی خەلکی کر ئەگەر وان چەك ڤێ هەبیت دێ هێنە لێبورین، لەورا خەلك ل وی چەکی دگەریان، کو پێشمەرگەی ل وێ دەڤەرێ ڤەشارتبوو، پاشی دانپێدان کر کو ئەو پێشمەرگەنە، ل داوییێ هەمی بێ سەروشوینکرن.

دماوێ هەوێن ئەنفالێن (٥، ٦، ٧)، (٥٢) پێنجی و دوو گوند، ل ناحیێن (خەلیفان و رەواندز و خوشناو) وێرانکرن، کو سەرجەم خێزانێن وان (٢٦٠٢) بوون، هەروەسا ٢٤ قوتابخانە و ٥٢ مزگەفت، ژبلی هشککرنا بسەدان کانی و جۆکان و سوتنا رەز و باغ و بیستانێن وێ دەڤەرێ، کو ژێرخانا ئابووری پێك دئینا، کو رهـ و ریشالێن ژین و ژیارا خەلکێ دەڤەرێ دبنیرا هەلکێشا و سەروسامانێ وان هاتە تالانکرن.

## ئەنفالا دوماهیێ (بەهدینان) ژ ٢٥ێ تەباخێ - ٦ ئەیلولا ١٩٨٨ێ:

ل داویا راوستاندنا شەڕێ عیراقێ - ئیرانێ، دوماهیك هەوێن ئەنفالا ل ٨ی تەباخا ١٩٨٨ دەستپێکر، سوپایێ عیراقێ دەست ڤەکری بوو بۆ ئەنفالکرنا دەڤەرا بەهدینان. ئەڤ هەوە ب درێژیا دەڤەرێن (زاخۆ، ئامێدیێ، شێخان و ئاکرێ) ڤەگرتییە. هەروەکیجارێن بەراهیێ ژ ئەنجامدانا هەوێن دیێن ئەنفالا، ئێکەم جار جهێن ستراتیژییێن دەڤەرێ توپ بارانکرن ب توپێن ئویشەکی (عنقودی) و کیمیاوی.

دژوارترین هێرشا ئویشەکی ل ٢٤ی تەباخێ بۆ سەر گوندێن سپینداریێ ل بنارێن چیایێ گارەی بوو، رۆژا دویڤدا ئەڤ دەڤەرە بەر دژوارترین هێرشا کیمیا بارانکرنێ کەفت، ل ڤێ هەوێ گوندێن چیایێ گارەی ب رێژیا (٣٠) کم ڤەگرت، کو نێزیکی پێنجی گوندا بوون، ژ لایێ باکووریڤە گوندێن (دهیکێ، باوەرکا کەڤری، مێزێ، سپینداریێ... هتد). ل سەر چیایێ گارەی ژی گوندێن (گەرەگو، زێوە شکان، رەزیکێ... هتد). ژ لایێ باشوور (سیارێ، ئاڤوکێ، و چەند گوندێن دی). ل سپێدەهیا ٢٥ێ تەباخێ فروکێن جەنگی گوندێن برجینێ و ناحیا زاویتەی دەڤەرا زێی خابیری و هێسێ و خرابە و ئێکمالێ و بەرواری ژێری کیمیا بارانکرن. ئەگەر هەڤبەرکرنەکێ دناڤبەرا دژواریا تۆپ بارانکرنێ و هژمارا قوربانیان بکەین، دێ بۆ مە دیاربیت کاریگەریا وێ کیمیا بارانێ کێمترە، ئەگەرێ وێژی بۆ هندێ دگەریتن کو پێشمەرگەی شیان بەراهیێ شیرەت و رێنماییێن خو پاراستنێ بەلاڤەبکەن، بەلێ تەرش و کەوال و ئاژەلێن گوندان ژناڤ چوون و زەڤییێن وان ژبەر هەمی کەفتن.



پشتی ئەنفالێ بەرەف ئیرانێ دچن

ئەنفالا دوماهیێ یا (بەهدینان) ب دوو ساخلەتێن ژ هەوێن دی دهێتە جوداکرن (دەڤەرێن قەرەداغ و گەرمیان و ئاڤزیلا زیێ بچویك و دۆلا شەقلاوا و ڕەواندوز)ێ ژبەر چەند ئەگەرەکا:

١. هندەك ژ عەشیرەتێن دەڤەرێ پەیوەندیێن باش دگەل رژێما عیراقێ هەبوون، کو بوویە ئەگەرێ پاراستنا ژ کوشتن و تالانکرن و وێرانکرنا گوندێن وان.

٢. جیۆپولیتکا دەڤەرێ: جوگرافیا سیاسی یا دەڤەرێ ژبەر هندێ کو ئەڤ دەڤەرە هەڤ سنوورێ تورکیا و سنوورێ نیڤ دەولەتیە، دیارە رژێما عیراقێ ژی ڤیایە ب نهێنی کۆم کوژیێ ل ڤێ دەڤەرێ ئەنجام بدەت، چونکی تورکیا هەڤ سنوورێ ولاتێن ئەوروپایە، و دبیتن رێکخراوێن مافێ مرۆڤی و رۆژنامە نڤیسێن بیانی بگەهنە دەڤەرێ و ئەو تاوان ئاشکرابیت و حکومەتا عیراقێ توشی سزاییێ بکەت،

ئانكو ولاتێن ئەوروپا ل بن گڤاشتنا رایا گشتی جارەكادی چاڤ خشاندنەكێ بسەر پەیوەندییێن خو دگەل عیراقێ بكەتەڤە.

ل ٢٨ێ تەباخێ هێرشا ئەردی دەستپێكر د ئەنجام دا دەهان هزار ژ ئاكنجییێن وێ دەڤەرێ دەربەدەری توركیا و ئیرانێ بوون و هژمارەك ژی هاتنەگرتن. هندەك ژ وان ژی ل دویڤدا ب ناچاری ل لێبورینا ٦ی ئەیلولا ١٩٨٨ خو دانە دەستێ رژێمێ ل ئیڤاریا ٢٩ی تەباخێ ب هزارەهان كەس دەڤەرێن زێبار و بەرێ گارەی ل سەر (ڕوویێ شین) ب هەمی لایەكی ڤە هاتنە دوورپێچ كرن. ئەو خەلكێ ڤەگەریای هاتنە ڤەكوهاستن بۆ دوو بنگەهێن كۆمكرنێ، پشكەك ژ وان كو گەنج بوون، ل كەلها (نزاركێ) ل دهوكێ كۆم كرن، كو وەك (توبزاوا) كەركووكێ بوو. ژن و زارۆك ژی بۆ زیندانا (سەلامیە) ل مویسل هاتنە ڤەگوهاستن.

سەرجەمێ گوندێن وێرانكرییێن هەوێن ئەنفالا دوماهیێ ل دویف پێزانینان (٤٥٠) چوار سەد و پێنجی گوندبوون. زیانێن گیانییێن ئەنفالا بەهدینان ب نێزیكی (٣٢٠٠٠) سیه و دوو هزار كەسان دهێتە خەملاندن، گولەبارانكری و بێ سەروشوین كرن، ژ (١٠٠) هزار كەس ژی پەنابەری و دەربەدەری توركیا و ئیرانێ بوون، ئەوێن دی ژی ڤەگوهاستن بۆ كۆمەلگەهێن (جەژنیكان) ل نێزیك هەڤلێرێ.



خۆ بەرهەڤکرنا بۆ مشەختبوونێ پشتی ئەنفالێ

ئەو پەنابەرێن کۆ بەرەف تورکیا ڕەڤین، دەستپێکێ حکومەتا تورکیا رازی نەبوو ب حەوینیت. ئەوێن ژ سنوورێ تورکیا ژی دەربازبووین هندەك ژ وان دانە دەستێ حکومەتا عیراقێ، رێك نەدانە رێکخراوێن مرۆڤی و ڕۆژنامە نڤیسان سەرا وان بدەن، دا بۆ وان ئاشکرا بیت، ئەرێ چەکێ کیمیاوی دژی وان بکارهاتیە یان نە. ل مەها سالا ١٩٨٩ (٣٠٣٤) سیهـ هزار و سیە ـ و چوار کەس ل ئۆردوگایەکێ تورکی، ب ئەگەرێ نانێ ژەهراوی بوون ئەڤ کارە ژی ب هەڤپشکی دناڤبەرا زەلامێن رژێما عیراقێ و کاربەدەستێن تورکیا هاتبوو ئەنجامدان.

ڕژێمێ هەر ب ئەنفالکرنا کوردان ڤان دەڤەراندا نەڕاوەستیا، بەلکی وێ هێرشێ گوندێن مەسیحیان ژی ڤەگرت. پشتی بارانکرن و سوتاندنا گوندێن وان، ئاکنجیێن وێرێ ڕەڤین، ئەوێن دی ژی هاتنە گرتن و ئێخستنە بنگەهێن کۆم کرنا ئەنفالێ ل زیندانا سەلامیێ ل مویسل، هژمارەکا وان ژی ل دویف پێزانینان (١٥٢) سەد و

پێنجی و دوو کەس بوون هاتنە گوللە بارانکرن، پڕانیا وان خەلکێ گوندێن (مێزی ل سەرسنکێ و گوند کوسە ل دەڤەرا (دوسکی) و کانی بەلاڤێ ل بەروارى بالا و گوندێ باشی و ڤارو (کەرو) ل نێروە و دێرەشێ ل ئامێدییێ بوون).

ل ڤان تاوانێن مەزنێن ئەنفالێ بۆ سەر کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی. نابیت ڕۆلێ فەوجێن بەرگریا نیشتمانی (جاشێن کوردان) ژبیر بکەین، کو هاریکاریەکا باش بۆ سوپای دکر و ل هندەك دەڤەرا ژی پێشرەو یا سوپایێ رژێمێ دکرن، چونکی شەهرەزا بوون ل وێ دەڤەرێ و ڕۆلەکێ بەرچاڤ هەبوویە، ل تالانکرنا مالێ و سامانێ گوندێن ئەنفالکری و گرتنا خەلکێ سڤیل ئەوێن ژ ترسا سوپایێ رژێمێ دڕەڤین بۆ هندێ خۆ رزگار بکەن.

## ئەنجامێن ئەنفالێ و کارتێکرنا وێ ل سەر کوردستانێ

تشتەکێ ئاشکرایە کو سیاسەتا رژێما بەعس، هەر ژ وەرگرتنا دەستهەلاتداریێ، ل سالا ١٩٦٨ ئارمانجا وێ نەهێلانا گەلێ کورد بوو ل عیراقێ، بۆ بجهئینانا پلانێن خو، ئێك ژ دامەزرێنەرێن حزبا بەعس (میشێل عەفلەق) دبێژیت: (کورد ل عیراقێ و سوریا، بەربەر ل ڕۆژئاڤایێ نیشتمانێ عەرەبی ئاستەنگن بۆ دروستبوونا ئێکەتیا نیشتمانیا عەرەبی، لەوڕا پێدڤیە بهێنە ژناڤبرن).

بۆ بجهئینانا ئەڤێ ئاخفتنێ چەندەها جارا بەرنامە و پلان دانان بۆ ژناڤبرنا گەلێ کورد، هەر وەکی (عەلی حەسەن ئەلمەجید) دوویات دکەت و دبێژیت: (بتنێ رێکا ئازادکرنا خێزانێن زیندانیان و گرتیان، بن ئاخ کرنا وان ب ساخی یە).

سیاسەتا جینۆسایدا کوردان، ب بەردەوامی پەیرەوکر، بەلێ ل سالا ١٩٨٨ گەهشتە

گوپیتکا هۆڤانتی و دڕندایەتییێ، کو کاریگەری و شوینوارێ وێ ل سەر جڤاکێ کوردی هێلایە، کو هەتا نهۆ مرۆڤێ کورد پێ دنالیت، لەوڕا دشێین ئەنجام و کاریگەریا ئەنفالێ ب ڤی شێوێ ل خوارێ ڕێزبکەین:

١. وێرانکرنا پڕانیا گوندێن کوردستانێ، کو هژمارا وان ب پتر ژ (٤٥٠٠) چوار هزار و پێنج سەد گوندان دهێتە خەملاندن، ل هەر جهەکی شوینوارێ بەردەوامبوونا ژیانێ نەهێلان.
٢. بێ سەروشوینکرن و ژ ناڤبرنا نێزیکی (٢٠٠) دووسەد هزار مرۆڤێن کورد.
٣. هەرفاندنا ژێرخانا ئابووریا کوردستانێ، ب ڕێکا وێرانکرنا گوندان و زەڤیێن چاندنێ، کو بوویە ئەگەرێ ژناڤبرنا ڕێژەکا هەرە زۆرا سامانێ تەرش و کەوالێن دەڤەرێن کوردستانێ، دگەل تالان کرنا ماڵ و سامانێ گوندییان.
٤. تێکدان و راست کرنا جهێن دیرۆکی پەرستگەهان (مزگەفت و دێر) و ناڤەندێن خواندنێ و ساخلەمیێ.
٥. پەیرەوکرنا سیاسەتا ئەرد سوتنێ، ب کیمیا باران و ژەهرکرنا ژێدەرێن ئاڤێ، بۆ نەهێلانا هەمی ڕەنگێن ژیانێ ل ڤان دەڤەران.
٦. ژناڤبرنا بنەمایێن ژیانا خەلکێ گوندان و ئاکنجیکرنا وان ل کۆمەلگەهێن ب زۆری و گوهوڕینا مرۆڤێ کوردی ژبەرهەمهێنەری بۆ بەکاربەر، کارکرە سەر نزمکرنا ئاستێ ژیانا ئاکنجیێن رزگاربووی.
٧. هەلوەشاندنا شێوازێ کۆمەلایەتیا جڤاکێ کوردی و بەلاڤبوونا هندەك دیاردێن نەژهەژی کو بەرەڤاژی ڕەوشت و تیتال و بهایێن کۆمەلایەتی یێ جڤاکێ کوردی بوو.

## پرسیارێن پشکا پێنجێ

**پ ١/ ڤان زاراڤا پێناسه بکه:**

ئەنفال، سەربازگەها توبزاوە، نوگرە سەلمان، کۆمەلگەها سوسێ، تۆپا ئیشوکی، زیندانا سەلامیە، فەوجێن بەرگریا نیشتمانی، کۆمەلگەهێن جەژنیکان، گوندێ بلەی خوارێ، سێوسێنان.

**پ ٢/ هوبێن ئەڤان دیاربکە:**

١. رۆژا (١٤ نیسانا ١٩٨٨) ل هەمی سالان کریە رۆژا بیرهاتنا تاوانا مەزنا ئەنفالێ ل کوردستانێ.

٢. هژمارا گرتی و بێ سەروشوینکرنێن گەرمیان ل هەمی هەوێن دی زێدەتر بوو.

٣. ئەگەر بەراوردیەکێ دناڤبەرا دژواریا تۆپ بارانکرنا کیمیاوی و هژمارا قوربانیێن دڤەرا بەهدینان بکەین، بۆ مە دەردکەڤیت کارتێکرنا کیمیا بارانێ کێمترە.

٤. هێزێن رژێمێ ل هەوێن ئەنفالا سێیێ ئاڤا سکرێ دوکان بەردا بوو.

**پ ٣/ ئەنجام و کارتێکرنا ئەنفالێ ب سەر کۆمەلگەها کوردی چییە؟**

**پ ٤/ کوردستان مەرجێ ب هێزبوونا دەولەتا عیراقێ یە، ئەڤێ دەستەواژێ شرۆڤەبکە؟**

**پ ٥/ ئەگەر ل رێورەسمێن دووبارە ڤەشارتنا قوربانیێن ئەنفالێ ل دەڤەرا خو ئامادەبووی، تەهەست ب چ کر، ئەوی هەستی بۆ هەڤالێن خو روون بکە؟**

**پ ٦/ چەوا ئەنفالێ ب دیتنا ئایینی ئیسلامێ شرۆڤە دکەی؟**

# پشکا شەشێ
## جینۆساید

### زاراڤێ جینۆساید:

جینۆساید زاراڤەکە ژ دوو برگا پێکهاتییە، (جینۆ (Genos) پەیڤەکا گریکیە (یونانی) ب رامانا رەگەز یان نفش دهێت، (caeder) پەیڤەکا لاتینیە ب رامانا ژ ناڤبرن و قرکرنێ دهێت، هەردوو پەیڤ پێکڤە ب رامانا قرکرنا رەگەزی دهێت.

ب کارئینانا زاراڤێ جینۆساید بۆ جارا ئێکێ ژ لایێ شارەزایێ یاسایێ یێ پۆلەندی (رافائیل لیمیکین) ل مەدرید دکونفراسەکیدا ل سالا ١٩٣٢ ب کارئینایە و ل سالا ١٩٤٢ بنڤیسین تومارکرییە. هەمی خێزانا ڤی یاسازانی ب دەستێ ئەلمانییا هاتبوونە ژناڤبرن.

### جۆرێن جینۆسایدێ:

١. جینۆسایدا لەشی: پێکهاتییە ژ کوشتن و ژناڤبرنا کەسێن جڤاکی. ب رەنگەکێ راستەوخو یان نە راستەوخو، وەك (گوللە بارانکرن، ب ساخی بن ئاخ کرن، بێ سەروشوینکرن، سێدارەدان و ب کارئینانا چەکێ کۆم کوژ، بۆ نموونە کیمیا بارانکرنا گوندان و باژێرێ حەلەبجە ل کوردستانێ، ژ لایێ رژێما عیراقێ و ب کارئینانا چەکێ فسفوری و ژەهراوی دژی گەلێ کورد، ب ساخی بن ئاخ کرنا ئەنفالکریان ل بیابانێن رۆژئاڤایێ عیراقی. کوشتن و ژناڤبرنا نێرن (ژکور) یێن

بارزانیان و گەنجێن کوردێن فەیلی، تۆپ بارانکرنا باژێرێ قەلادزێ ب بۆمبێن ناپالم، ئەڤە دیارترین جورێ قڕکرنا لەشینە دژی گەلێ کورد ل عیراقێ.



دەرئێخستنا پیر و زارۆکێن کورد ب ساخی بن ئاخ کرنا گەنجان ل گۆڕستانا ب کۆمەڵ

**٢. جینۆسایدیا بایەلۆژی:** ئەڤ جۆرە پێکهاتییە ژ رێگرتن ل زێدەبوون و وەرارکرنا کۆمەڵەکا مرۆڤێن ئێك ڕەگەز ب ڕێکا نەزۆك کرنێ و ژبەر برنا (ڕجهاچ) یا ئافرەتان و خەساندنا زەلاَمان و ژێك جوداکرنا ژن و زەلاَمان بۆ دەمەکێ درێژ. ئەڤ تاوانە ل هەوێن ئەنفالان ل سالا ١٩٨٨ ل کوردستانێ هاتنە بجهـ ئینان، ب تایبەتی ب بنگەهێن کۆم کرنا ئەنفال کریان ل دەمێ جوداکرنا زەلاَمان ژ ژنێن وان، و ب هەمان شێوە جوداکرنا زەلاَمێن بارزانیان ژ خێزانێن وان ل سالا ١٩٨٣.

**٣. جینۆسایدا کەلتوری:** قەدەغەکرنا زمانێ زکماکی و تێك شێلاندنا دیرۆك و کەلتورێ کۆمەکا مرۆڤان و نەهێلانا شوینوارێ شارستانی و دیرۆکی ڤەدگەریت. ژ

وێران کرن و تێك شێلاندنا جهێن دیرۆکی، کو پاشماوێن کەڤن و نویێ ئاکنجیێن وێ دەڤەرێنە، وەکی هەرفاندنا مزگەفت و دێر و کەلهێن دێرین و پەیکەران، کو ناسناما دیرۆکا ئاکنجیێن وێ دەڤەرێنە. ژ لایێ پڕانیا نەتەوەییێن بالا دەست ڤە بزاڤێن بێ سنوور دهێنە دان خو ژ ڤڕکرنا ڕەگەزێ و نەتەوەیی، بۆ بنبڕکرنا زمان و ڕوشەنبیری و دیرۆکا ئەوان نەتەوەییێن کو ل ناڤ نەتەوەییێن زۆر دژین. جینۆسایدا کەلتوری ل گەلەك جهێن جیهانێ دهێتە پەیرەوکرن، وەکی ل تورکیا و ئیران و عیراق و سوریا دەرهەڤێ گەلێ کورد دهێتە کرن، ل باکوورێ ئەفریقیا دژی (ئەمازیغان) و ل سودان دژی ئاکنجیێن دارفور و ل میانمار دژی موسلمانێن وی وڵاتی دهێتەکرن ... هتد

نموونە ل کوردستانێ گەلەکن بەرامبەر وان ڕەفتارا ئەوێن ڕژێمێن عیراق و ئیران و تورکیا و سوریا بەرامبەر ب گەلێ کورد کرینە.

ل عیراقێ ل سالێن هەشتیاندا رژێمێ جارەکا دی دووبارە دیرۆك نڤیسی ڤە. ب ڕەنگەکی کو دخزمەتا بیروبۆچونێن بەعسی بیت ... هتد.

ل تورکیا کورد ژ ناڤ و نیشانێن وان بەهرکرن، تورکێن چیا ب سەر وان سەپاند. ل ئیرانێ کورد ب هۆزەکا ئیرانی یا کەڤن هاتە دانان و زمانێ کوردی ژی ب دیالێکتەکا زمانێ فارس هاتە دانان. ل سوریا ژی کورد ل جهێ باب و باپیرێن وان ب بیانی هاتنە دانان و هەتا ناسناما هەڤوڵاتی بوونێ ژی ژێ ستاند ... هتد.

**٤. جینۆسایدا ئابووری:** پێکهاتیە ژ برسیکرنا ئاکنجییان ب ڕێکا ڕاست کرنا زەڤیێن چاندنێ و ژناڤبرنا ئاڤێ و ڕێك گرتن ل کارکرنێ بۆ ژیارا ژیانێ و ژناڤبرنا

هوکارێن بەرهەم هێنانا کۆمەڵەکا خەلکی. ئەڤ جۆرێ جینۆسایدێ وەکی جۆرێن دی گەلەك ب ئاشکرایی و روون ل کوردستانێ بەرچاڤ دبیت. پتر ژ (٤٥٠٠) چوار هزار و پێنج سەد گوندێن کوردستانێ دگەل ئەردی هاتنە راستکرن ئەو مرۆڤێن کو دەستێ کاری بوون هاتنە ژناڤبرن، ب ساخی بن ئاخ کرن و سێدارەدانو گوللە بارنکرن ... هتد هەرچ ماڵ و سامان هەبوون ل دەڤەرێن کەفتینە بەرهەوێن ئەنفالان هەمی ب تالانێ برن. ئەڤ تاوانە بتنێ د ماوێ هەوێن ئەنفالان دا ئەنجام نەداینە بەلکێل بەراهیێ ژی بەرامبەر کوردێن فەیلی و بارزانیان ئەنجام دایە، ل سالێن (١٩٨٠ - ١٩٨٣)، هەرچ هەبوو دەست ب سەرداگرت و ب تالان بر و ئەوخەلکەژی چاڤەرێی دانەکێ خوارنێ بوون، ئەگەر رژێمێ دابا وان.

دوورپێچا ئابووری شێوازەکێ هاڤی نەبوویە دژی جڤاکێ کوردی، کو بەردەوام رژێمێن عیراقێ، بۆ ملکەچکرنا گەلێ کورد و بزاڤا ڕزگاریخوازا کوردی پەیڕەوکرییە، ژ برسیکرن و وێرانکرنا ژێدەرێن داهاتێ ژیانا جڤاکی کوردەوارییێ.

## رژێما عیراقێ بۆ پەیڕەوکرنا جینۆسایدا ئابووری بەرامبەر گەلێ کورد چەندین شێواز گرتنە بەر کو ئەڤەنە:

١. سەپاندنا دوورپێچا ئابووری ل سەر کوردستانێ ب گشتی و دەڤەرێن ئازادکری ب تایبەتی.

٢. مین - ڕێژکرنا پڕانیا زەڤیێن چاندنێ یێن دەڤەرێن چیایی کو ژێدەرێ ژیارا ئاکنجیێن وێ بوون.

٣. پەڤاندن و هشکرنا پڕانییێن ژێدەرێن ئاڤێ و ژەهرکرنا کانیان.

٤. سوتنا ڕەز و باخ وپاوان و زەڤیێن چاندێ و بڕینا دارستانان ب مەرەما ژناڤبرنا ژێدەرێن داهاتێ ژیارا ئاکنجییێن ئەوێ دەڤەرێ.

٥. ب زۆری هنارتنا زەلامێن دەڤەرێن کوردی بۆ ناڤ ریزێن سوپای و سوپایێ میللی (الجيش الشعبي) و جاشاتییێ، ب تایبەتی ل دەمێ شەڕێن ڕژێمێ دگەل ئیرانێ یان دگەل پێشمەرگەی.

بەلێ ل سالا ١٩٨٨ ل ماوێن هەوێن ئەنفالان دا رژێمێ بێ گوهـ بدەتە چ یاسایەکێ، هەرچ ژێرخانا ئابووریێ کوردستانێ هەبوو ب تەمامی وێران کر، ب جۆرەکی ئەگەر چەندین سالان ئاڤا بکەنەڤە، نەزڤریتەڤە ئاستێ بەرێ.

## ڕێکەفتناما قەدەغەکرنا جینۆسایدێ:

ژبەر ئەو تاوانێن مەزن و کۆمکوژیانە کو دژی مرۆڤایەتی دهاتنە ئەنجام دان، چ دماوێ جەنگێ جیهانی یێ دووێ یان ل پشتی ئەوی جەنگی، کو ب ملیونەها مرۆڤ بوونە سوتەمەنیێ سیاسەتا ڕەگەز پەرستان بۆ ژناڤبرنا نەتەوێن ل بن دەستێن وان. ئەڤجا بۆ هندێ ریێك ل دووباربوونا شەڕی و کارەساتا بهێنە گرتن، هەردڤی چارچوڤەی دا کۆمەلا گشتی یا نەتەوێن ئێکگرتی ل دەسپێکێ ڕێکەفتناما قەدەغەکرنا تاوانا جینۆسایدێ دا ب بریارا هژمارە (٩٦) رۆژا ١١ێ کانونا ئێکێ سالا ١٩٤٦ل دویڤ وێ یاسایێ جینۆساید ب تاوانەکا نیڤ دەولەتی دانان چونکی ئەڤ تاوانە بەروڤاژی ئارمانجێن نەتەوێن ئێکگرتینە. ژبەر گرنگیا ئەڤێ ڕێکەفتنامێ، دێ ئاماژێ ب ناڤەرۆکا ماددێن گرنگك کەین:

**ماددێ ئێکێ:** لایەنێن وێ رێکەفتنامێ رێکەفتن ل سەر هندێ کو جینۆساید تاوانەکا نیڤ دەولەتییە، چ ل دەمێ شەڕی یان د ئاشتییێدا هاتینە ئەنجامدان، لەورا سوزا قەدەغەکرنا تاوانا جینۆسایدێ و سزادانا ئەنجام دەرێن وی دایە.

**ماددێ دووێ:** جینۆساید ئەڤان تاوانێن ل خوارێ ڤەدگرێت، کو ب مەرەما ژناڤبرنا پشکەکێ یان کومەکا نەتەوەیی یان ڕەگەزەکی تەمام دابیت پێك هاتینە ژ ئەڤانێن ل خوارێ:

١. کوشتنا ئەندامێن جڤاکی

٢. زیان گەهاندنا جەستەیی (لەشی) یان گیانی ب ئەندامێن جڤاکی

٣. جوداکرنا کومەکا خەلکی دسەروبەرەکێ ژیارا دژوار و سەخت، بۆ ژناڤبرنا پشکەکا وان یان هەمیان.

٤. دانانا ئاستەنگان ل بەر زێدەبوونێ (زاوزێ) دجڤاکی دا.

٥. ژێك جوداکرنا زارۆیان ژ دایك و بابێن وان (خێزان) بۆ جڤاکەکێ دی.

**ماددێ سێیێ:** ئەنجامدەرێن ئەڤان تاوانێن ل خوارێ دهێنە سزادان:

١. ئەنجامدانا جینۆسایدێ.

٢. پلان گێران بۆ ئەنجامدانا جینۆسایدێ.

٣. هاندنا راستەوخو و نەراستەوخو بۆ ئەنجامدانا جینۆسایدێ.

٤. بزاڤکرن بۆ ئەنجامدانا جینۆسایدێ

٥. پشکداریکرن د جینۆسایدێدا.

**ماددێ چوارێ:** هەر تاوانەك ژ وان تاوانا كو دماددێ سێیێدا ئاماژە پێكری ل دویف رێكەفتنامێ دهینە سزادان، ئەڤجا كەسێن دەسەلاتداریا دەستووری یان فەرمانبەرێن گشتی یان كەسەكێ ئاسایی بن. ئەنجامدەرێن ئەوێ تاوانێ ل هەر بوستەكێ بن ژ ئەوێن ئاماژە پێ هاتیەكرن پاراستی نابن (حصانة)، ژ وان تاوانان و ناهێنە لێبورین.

**ماددێ پێنجێ:** هەمی ئەو ولات و لایەن كو ئەو رێكێفتناما ئیمزاكری، پێگێریا خو و وەلاتێ خو دووپات كریە بۆ بجهـ ئینانا ناڤەرۆكا وێ رێكەفتنامێ، ب تایبەتی سزادانا ئەنجامدەرێن جینۆسایدێ و هەر تاوانەكێ ژ تاوانێن ماددێ سێیێ.

**ماددێ شەشێ:** ئەنجامدەرێن هەر تاوانەكا د ماددێ سێیێ یا تاوانا جینۆسایدێ هاتی. ل بەرامبەر دادگەها نافخویا تایبەت ئەوی ولاتی كو تاوان ل سەر ئاخا وێ هاتیە ئەنجامدان دێ هێتە دادگەهكرن.

یان و ل بەردەم دادگەها تاوانا نیف دەولەتی دێ هێتە دادگەهكرن ئەگەر دشیاندانە بوو ل دادگەها نافخو بهێنە دادگەهكرن.

**ماددێ حەفتێ:** ئەو تاوانێن ماددێ سێیێ یێ جینۆسایدێ، ئاماژە پێ هاتیەكرن ب تاوانەكا سیاسی ناهێتە دانان و ئەنجامدەرێن تاوانێ نەشێن ل ولاتێن دی مافێ پەنابەریا سیاسی وەربگرن، جونكی دەولەتێن ئەندام دئەڤێ

ڕێکەفتنامێدا سۆزەك و ئیمزاکریە، کو گونەهبارێن جینۆسایدێ ژی بدەنە دەستێ وەلاتێن وان.



گورستانا ب کۆم یا کیمیا بارانا هەلەبجە

**ماددێ هەشتێ:** هەر لایەنەکێ ئەڤێ ڕێکەفتنامێ بۆ هەیە داخازێ ژدەزگەهێن تایبەت ب نەتەوێن ئێککگرتی ڤە بکەت، کو لدویف پەیمانا نەتەوێن ئێککگرتی هەر ڕێکا گونجای بگریت بۆ قەدەغەکرن و سەرکوت کرنا تاوانێن جینۆسایدێ یان هەر تاوانەکێ ژ تاوانێن مادێ سێیێ یێ وێ ڕێکەفتنامێ.

**ماددێ نەهێ:** ل سەر داخازا هەر لایەنەکێ هەڤرك بۆ گرفتێن دناڤبەرا ڤێ ڕێکەفتنامێ دشێن داخازێ ژ دادگەها نیف دەولەتی بکەت، یا گرێدای ب شرۆڤەکرنێ ئانکو ب جهێنانا بەندێن ڕێکەفتنامێ ئانکو یا گرێدای ب وان

کێشێن پەیوەندی ب بەرپرسایەتیا هەر دەولەتەکێ ڤە هەی ل بیاڤێ جینۆساید ئانکو هەر تاوانەکێ ژ وان تاوانێن ژ ماددێ سێیێ یێ ڤێ رێکەفتنامێدا هاتی.

**ماددێ دەهێ:** لدویف رێکەفتنامێ ب سەرڤەنەچوونا تاوانێن جەنگی دژی مرۆڤایەتیێ، تاوانێن جینۆسایدێ ب بورینا دەمی ب سەرڤە ناچیت. ئانکو تاوانێن جینۆسایدی چەند کەڤن ژی بیت، سەرڤە ناچیت و ئەنجامدەرێن وان دهێنە دادگەهکرن.

جینۆساید ل یاسایا نیڤ دەولەتی وەکی تاوانەکا سەربەخۆ کو تایبەتمەندیا جودا هەیە دگەل تاوانێن دی. **لەورا ل تاوانێن جینۆسایدێ دوو پێکهاتێن گەلەك گرنگك هەنە.**

١. ئارمانج: ئەڤ تاوانە ژ تاوانێن دی جودایە، چونکی مەرەما سەرەکی یا جینۆسایدی ژ ناڤبرنا پشکەکێ یان سەرجەمێ کومەکا مرۆڤانە. لەورا ئارمانجا نەهێلانا کومەکا مرۆڤان، پشکەك بیت یان سەرجەمێ وان بیت، تایبەتمەندیێ ب جینۆسایدێ ددەت و تاوانێن دی جودا دکەت.

٢. ژ لایێ هژمارێ: ژبەر ئەوێ جینۆساید، ئارمانجا ژناڤبرنێیە، لەورا هژمارا قوربانیا بەرچاڤ ناگریت. ئانکو بتنێ پێشنیارکرنە بۆ ژناڤبرنا هەر کۆمەکا مرۆڤان بیت، ئێدێ مەرەما وێ دێ دروست بیت ئەنجامدانا ئەوێ تاوانێ ژی مەرج نینە، هژمارا قوربانیان گەلەك بیت کێم و زۆری گرنگك

نینە و ل بەرچاڤ ناهێتە گرتن بۆ دیارکرنا جینۆسایدێ و ئەنجامدەرێن ئەوێ تاوانێ.

## سیاسەتا جینۆسایدێ ل کوردستانێ:

ل چارچوڤێ سیاسەتا وان ولاتێن کوردستان ب سەر هاتیە دابەشکرن:

(عیراق - ئیران - تورکیا و سوریا) کێشا کوردان هەتا نهۆ بێ چارەسەری مایەڤە و نەتەوەیا کوردژی ب دابەشکری کەفتیە بەر هێرشێن دڕندانە و قڕکرنا ڕەگەزی، لەوڕا گەلێ کورد وەکی نەتەوەکێ بن دەست کەفتیە بەر مەترسیەکا مەزن ژ لایێ دیرۆکی و کەلتووری و ئابووری ڤە، کوردستان وەسا هاتیە تێك شێلاندن رۆژ ل دویف رۆژێ تایبەتمەندیێن وێ پتر تێکدچیت.

سیاسەتا وان ولاتێن کو کوردستان ب سەر وان هاتیە دابەشکرن، پێکهاتیە ژناڤبرنا شارستانیەت و کەلتوورێ کوردی، هەردەم وان هەول دایە بەر ڕاستیێن دیرۆکی ڤە شێرن، کو گەلێ کورد ژ نەتەوەیێن هەڕە دێرینێن یێن ڕۆژهەلاتا ناڤینن.

## تاوانێن جینۆسایدا گەلێ کورد ل عیراقێ:

هەر وەکی د پشکا ئێکێ دا مە ئاماژە پێکری، ل دەستپێکا دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ. و گرێدانا باشوورێ کوردستانێ بۆ ولاتێ عەرەبیێ عیراقێ ڤە، کێشا کورد بوویە کێشا سەرەکی یا عیراقێ. حکومەتێن ئێك ل دویف ئێکێن عیراقێ حاشاتی ل مافێ گەلێ کوردکریە ددیارکرنا چارەنڤیسێ وان سیاسەتەکا بەرنامەکری دانایە بۆ حەلاندنا نەتەوەیا کورد دئامانێ (ب عەرەب بوون) دا د چارچوڤێ دەولەتا عیراقا عەرەبیدا.

ل سالێن ١٩٣٣ - ١٩٣٤ ز بۆ ژناڤبرنا سەرهلدانا بارزان ل دەڤەرێن (بەرۆژ و مزویری و شێروان)، ٧٩ حەفتێ و نەهـ کوند وێرانکرن. ل دەستپێکا هاتنا پاسوانێن نەتەوەی (الحرس القومي) سەرحوکمرانییێ ل سالا ١٩٦٣ (٢٠٠) دوو سەد گوند سوتن و پتر ژ (٢٠٠٠) دوو هزار کەسان ژی کوشتن. هەر ل ڤی دەمی دا ب سەدان کەس ژ ژیێ و تەخێن جودا هاتنە گرتن. ل دەشتا کەندێناوە سەر ب پارێزگەها هەولێرێ، هژمارەکا گوندان سوتن و وێران کرن. ل دەوروبەرێن باژێرێ کەرکووکێ (٤٠٠٠٠) چل هزار کەس ژ جهێ وان دەرئێخستن و هۆزێن عەرەب ل جهێ وان ئاکنجی کرن. خویندن ب زمانێ زکماکێ کوردی قەدەغەکر، ناڤێ گوندا ژی کرنە عەرەبی. ئەڤ تاوانە دەڤەرا شنگالێ ژی ڤەگرت. هەوەکی مە ل بابەتێن بەرێ ئاماژە پێ کری ل سالا ١٩٦٨ز پشتی بەعسییان دەست ب سەر دەستهەلادا عیراقێ داگرتی ئەو تاوان پتر بەرفرەهـ بوو. ل سالا ١٩٦٩ سوپایێ عیراقێ هێرشەکا سەرتاسەری بۆ سەر دەڤەرێن ئازادکری راگەهاند، هەرچییێ کەفتیە سەر ڕێکا وان ئەوان تالان کر و ئاگرێ بەردایێ، هەتا مرۆڤێن دەڤەرێ ژوێ سوتنێ رزگارنەبوون، بتنێ ل شکەفتا (دەکا)، کو ئاکنجییێن دوو گوندان ژ ترسا سوپای خو تێدا ڤەشارت بوو (٦٧) شێست و حەفت کەس ژ ژن و زارۆیان ل ناڤ شکەفتێ سوتن. ل سالێن (١٩٧١ - ١٩٧٣) تاوانا دەرئێخستنا کوردێن فەیلی بۆ ئیرانێ و ستاندنا ڕەگەز ناما عیراقی ژ وان و دەرئێخستنا کرێکار و فەرمانبەر و خێزانێن کورد ل کەرکووکێ و خانەقین.

ل سالا ١٩٨٣ دەزگەهێن ڕژێمێ ل کۆمەلگەهێن ب زۆری ل دەروبەرێن هەڤلێرێ (٨٠٠٠) هەشت هزار زەلامێن بارزانیان برن و بەرزەکرن.

ل سالێن ١٩٨٧ - ١٩٨٨ تاوانێن جینۆسایدێ گەهشتنە گوبیتکێ ب شێوەکێ بەرفرەهـ چەکێ کیمیاوی ل کوردستانێ ب کارهات، کو هزاران کەس بوونە قوربانی. ئەڤ بابەتە مە ب درێژاهی ل پشکێن بەرێ بەحسکریە. کو ب ئاشکرا تاوانێن جینۆسایدا گەلێ کورد دسەلمینین هەتا نهۆژی رزگاربوییێن تاوانێ پێڤەدنالن.

## تاوانێن جینۆسایدێ ل پشکێن دی یێن کوردستانێ:

### جینۆسایدا کوردان ل باکوورێ کوردستانێ:

پشتی جەنگێ ئێکێ یێ جیهانێ و هەلوەشاندنا ئیمبراتۆریەتا ئۆسمانی و دامەزراندنا دەولەتا نوی یا تورکی (کۆمارا تورکیا)، سیاسەتا سەرکردێن نوی یێن تورک، هەمان سیاسەتا سەرکردێن عیراقێ بوو، بەلکی پتر و دڕندانەتر ژی بوو ژناڤبرن و نەهێلانا نەتەوەیێ کورد ل تورکیا، کو وان کورد ب (تورکێن چیا) دانە نیاسین، ئەڤەژی بوو ئەگەرێ پەراوێزکرن و بێ بەهرکرنا گەلێ کورد ل باکوورێ کوردستانێ ژ هەمی مافێن نیشتمانی و نەتەوەیی. ب ڕاگواستن و ژناڤبرنا ئاکنجیێن کورد دویر ئێخستنا وان بۆ دەڤەرێن دی یێن تورکیا، کو تورک پڕانینە و ئاکنجی کرنا تورکان ل جهێ کوردان ب مەرەما تێك ئێلاندنا دیموگرافیا کوردستانێ و ژناڤبرنا تایبەتمەندیا کەلتووری و دیرۆکی و کۆمەلایەتی. باژێر و باژێرکێن کوردی کو پڕانیا وێ دەڤەرێ بخوڤە دگریتن وەکی (بەدلیس، ئامەد، وان، هەکاری، موش، ماردین، ئورفە و سێرت ... هتد.

ژبلی ڤان قەدەغەکرنا زمانێ زکماکی و جل و بەرگێك و ناڤێن کوردی.

سیاسەتا تورکی پشت ب دەستووریٚ سالاٚ ۱۹۲٤ گریدابوو، کو تیٚدا هاتییە ژبلی تورکان وان دان پیٚدان ب چ گەل و نەتەوەیەکیٚ نەی تورك نەدایە.

پشتی ڤەمراندنا سەرهلدانا کوردان، کو شیٚخ سعید پیران ریٚبەریا ویٚ دکر ل سالیٚن (۱۹۲۵ - ۱۹۲٦)، سەدەها گوند و زەڤیێن چاندنیٚ ویٚرانکرن و مالیٚن وان ژی سوتن و تالان کرن و ئاکنجییٚن وان ژی بۆ دەڤەریٚن دییٚن رۆژئاڤاییٚ تورکیا ڕاگواستن، کو هژمارە زۆر یا وان ژبرس و سەرما دا مرن.

جینۆسایدا گەلیٚ کورد ل یاسا ژمارە (۸۸۵ ل ۱۹۲٦/٥/۳۱)، جڤاتا مەزنا نیشتمانیا تورکیا جیٚگیرکریە. و لدویف ئەڤیٚ یاسایێ هیٚرش بۆ سەر دەڤەریٚن کوردی ڕەوایە.

ل دەستپیٚکا سەرهلدانا (ئاگریٚ داغ ۱۹۲۷ - ۱۹۳۰) سەرجوم ئاکنجییٚن (۲۲۰) دوو سەد و بیست گوندیٚن ئەویٚ دەڤەریٚ کو ئەو سەرهلدانا ڤەگرتبوو، نیٚزیکی (۱۰۰۰۰) دەهـ هزار کەس بوون، هەمی بیٚ سەروشوین کربوون هەرئەو بۆ کوشتنا نیٚزیکی (۱۰۰) سەد رووناکبیریٚن کورد ب دەست و پییٚن گریٚدای هاڤتنە ناڤ دەریا (وان)یٚ. ل ۱۹۳۰/۱/۱، رژیٚما تورکیا بریار ب ڕاگواستنا ئاکنجییٚن هەریٚما دیٚرسم دا. پشتی ژناڤبرنا سەرهلدانا دیٚرسم ل سالاٚ ۱۹۳۷ کەمالیان ب ئاگر و ئاسنی بەربوونە گیانیٚ کوردان، (۱۵۰۰) هزار و پیٚنج سەد پیر و ژن و گە نج و زارۆك ب دەست گریٚدای ئیٚخستنە چالەکا مەزن و نەفت پیٚداکر و ئاگر بەردا وان.

جهیٚ ئاماژە پیٚدانیٚ یە، سەبارەت کۆم کوژیا دیٚرسم سەررۆك وەزیریٚن تورکیا ل سالاٚ (۲۰۱۲) داخازا لیٚبورینیٚ ژ کەس و کاریٚن قوربانییٚن دیٚرسم کر. ئەڤ هەلویستە بخو دان پیٚدان ب جینۆسایدکرنا کوردان ل باکووریٚ کوردستانیٚ.

تورك بەردەوام مژویلی سیاسەتا ب تورك كرنێ و ڕاگواستنێ و نەهێلانا سیمایێ نەتەوێ دەڤەرێن كوردانن، كو نهۆ ژی حوكمێ عورفی ب سەر وێ دەڤەرێ دا بجهـ دئینیت، رۆژانە چەندەها گەنج و لاوێن ئەڤان دەڤەران دكەڤنە بەر هێرشێن گرتن و ژناڤبرنێ.

## جینۆسایدا كوردان ل ڕۆژهەلاتا كوردستانێ:

كوردێن پشكا رۆژهەلاتێ ژی تووشی هەمان سیاسەتا ڤركرنا ڕەگەزی بووینە، ژ لایێ دەستهەلادارێن ئیرانێ ڤە دناڤبەرا هەردوو جەنگێن جیهانی حكومەتا ئیرانی سیاسەتا توند دژی كوردان ئەنجامدا ژ ڕاگواستنا ب زۆری بۆ دە ڤەرێن جودایێن ئیرانی.

ل سالا ١٩٣٥ پشكەكا زۆرا (گەلباخ و جەلالی و پیران)، بۆ (سولتان ئاباد و كرمان و شیراز) ڕاگواستن، هۆزا جەلالی كو ل سنوورێ ئیران - توركیا ئازەربیجانێ دژیان، نێزیكی (١٠٠٠٠) دەهـ هزار كەس بۆ ناڤەراستا ئیرانێ ڕاگواستن. سیاسەتا رژێما شاهێ بەهلەوی دان ب هەبوونا كوردان نەدا، وان كورد ب ئێك ژ هۆزێن ئیرانێ و زمانێ كوردی ژی ئێك ژ شێوەزارێ زمانێ فارس ددانا، پشتی كەفتنا كومارا كوردستانێ ل مهاباد، ل سالا ١٩٤٦ گەلەك درندانە كەفتنە گیانێ ئاكنجیێن مهابادێ و ئەو دەڤەرژی وێران كر و زمانێ كوردی قەدەغەكر كەفتنە بن شێلاندنا بارێ كۆمەلایەتی و كەلتوری و خراب كرنا بارێ ئابووری. ئەڤ پشكا كوردستانێ ژی ژیارا وان ل پشكێن دی یێن كوردستانێ باشتر نەبوویە. هەتا نهۆ كورد پەنابەر و

دەربدەر دبن. سیاسەتا جوداهیا مەزهەبی و نەتەوەیی ب سەر وان دا دسەپینیت و ڕوژانە گەنجان بەرەف زیندانێن ڕژێمێ دبەن.

## جینۆسایدا کوردان ل ڕۆژئاڤایێ کوردستانێ:

کورد ل ڕۆژئاڤایێ کوردستانێ (سوریا) بەردەوام تەپەسەریا نەتەوەیی بوو، شێوازێ جینۆسایدا کەلتووری و نەتەوەیی ل دژی پەیرەودکر، ب ڤەدەرکرنا دەڤەرێن کوردی دگەل ئێك دا، ئەوژی ب ئاکنجی کرنا هوزێن عەرەب دناڤبەرا کوردێن باکووری و ڕۆژئاڤای، وەکی پشتینەیەکێ بو ژێك ڤەدەرکرنا نەتەوەیێ کورد و جوگرافیا وی و پەیرەوکرنا ژناڤبرن و نەهێلانا زمانێ کوردی ل سالێن (١٩٤٥ - ١٩٥٨) ڕژێما سوریا عەرەبی پرانیا ئەفسەرێن کورد ژ سوپای دەرئێخستن ل سەر ژمێریا سالا ١٩٦٢ پتر ژ (٢٠٠) دوو سەد هزار کەس ژ ئاکنجیێن پارێزگەها جەزیرە، مافێ وەلاتیبوونێ ژێ ستاند وەکی ژێ ستاندنا مافێ ژیانێ، چونکی وان مافێ کارکرنێ و کڕین و فروشتن و ژن ئینان و شویکرنێ و دامەزراندنێ نامینیت. ژبلی ڤێ ژی ناڤێ گوند و باژێرێن کوردی گوهوڕین بو عەرەبی.

بابەتێن مە دەردکەڤیت کو ئەو ڕژێمێن کوردستان ب سەر وان هاتیە دابەشکرن، هەمان سیاسەتا ڤڕکرنا ڕەگەزی دژی گەلێ کورد پەیرەوکریە، چەندین شێوان وان بکارئینایینە بو نەهێلانا گەلێ کوردلەوڕا بەردەوام ل دژایەتی کرنا کوردان هەڤکاری و هەڤال بووینە سوز و پەیمان دناڤبەرا خودا گرێداینە. هەرئێك ژ وان وەلاتێن کو پشکەك ژ کوردستانێ بەرکەفتییە، ب چ جورەکی ب ئاخا کوردی نزانیت و دان پێدانێ ژی ب مافێن گەلێ کورد نائینیت.

## پرسیارێن پشکا شەشێ

**پ١/ ئەڤان زاراڤا پێناسە بکە.**

جینۆساید، جینۆسایدا کەشتی، جینۆسایدا بایلۆژی، جینۆسایدا کەلتوری، جینۆسایدا ئابووری، تورکێن چیایی، سەرهلدانا دێرسم.

**پ ٢/ جینۆساید دیاسایا نیڤ دەولەتی دا وەکی تاوانەکا سەربخۆ، تایبەتمەندیا جودا هەیە دگەل تاوانێن دی. ئەرێ ئەو تایبەتمەندی چنە؟**

**پ ٣/ ڕژێما عیراقێ بۆ پەیرەوکرنا جینۆسایدا ئابووری بەرامبەر گەلێ کورد چەندین شێواز بکارئینان، ب هویری روون بکە.**

**پ٤ / ئەڤان ڤالاتییێن ل خوارێ پربکە.**

١. جینۆساید ئەڤان تاوانێن ل خوارێ ڤەدگریت، کو پێکهاتیە ژ

١. ........ ٢. ......... ٣. ........ ٤. ......... ٥. .........

٢. لپەی ماددێ سێ ئەنجامدەرێن ئەڤان تاوانا دهێنە سزادان

١. ........ ٢. ......... ٣. ........ ٤. ......... ٥. .........

# پشکا حەفتێ

## ئێزدی



ئێزدی ب ڕەسەن کوردن، سەرباری هندێ کو ڕێژا وان ژ (٤ - ٥)٪ نابۆریت، هەتا نهو پارێزگاری ل کەلتور و دیرۆکا خۆ یا کوردایەتی کریە، ب تایبەتی ل پەیرەوکرنا ڕێورەسمێن خۆ یێن ئایینی (ئۆلی) چ زارەکی یان نڤیسینکی بیت، ژ نڤێژ و دوعا و سرودێن خۆ یێن ئایینی و پەرتووکێن خۆ یێن پیرۆز.

ئایینەکێ سەربەخۆ هەیە، پرانیا وان ل دەڤەرێن موسلێ و شنگالێ و پشکەك ژێ ژوان ل باکوورێ کوردستانێ و ڕۆژئاڤایێ و گورجستانێ و ئەرمەنستانێ دژین، کاریگەریا پێکهاتێن هەڤسوییێن وان ژ عەرەب و ئاشۆری و سریانی ل سەر هەیە، ژ ڕوویێ ڕوشنبیری و کەلتووریڤە. زمانێ وان یێ زکماکی کوردییە (شێوازی کرمانجی) میرێن وان ل میرگەها شێخان دژین، ڕوگەها وان (قیبلة) لالشە، و کۆرێ شێخ ئادی تێدایە.

## دابەشكرن و هژمارا ئاكنجیان

هژمارا ئاكنجییێن ئێزیدی ل جیهانێ لدویڤ هژمارا ڕێكخراوێن سەر بنەتەوەیێن ئێكگرتی دبن، نێزیك) )(٢,٥٥,٠٠٠)كەسك دبن, نێزیكێ (٧٥٠٠٠٠) حەفت سەد و پێنجی هزار كەس ل باشورێ كوردستانێ دژین و (٣٠٠٠٠) سیە هزار ژی ل ڕۆژئاڤایێ كوردستانێ ل باكوری ژی هژمارا وان ژ (٥٠٠) پێنج سەد كەسان نابۆریت، كو دەمەكی هژمارا وان ژ (٢٥٠٠٠) بیست و پێنج هزار كەسان پتربوون، بەلێ پرانیا وان بەرەڤ ئەوروپا چوون و مشەخت بوون كێمەك ژوان ژی ل ڕۆژهەلاتی هەنە، بەلێ پێزانینێن دروست ل بەردەست دان ینن بۆ سەلماندنا هژمارا وان.

## نازناڤ و نیشتمانێ ئێزدیاتی

دكەڤندا دگوتنە ئێزدیان داسنی، بەلێ پشتی دەركەفتنا شێخ ئادی هەكاری ب (سوحبەتی و هەكاری و شێخ ئادی) ناڤێ وان دەركەفت بوو، دبیتە نازناڤێ ئێزدیاتییێ ل سەردەمێ فەرمانراویا عوسمانیان هاتبیت، بناڤودەنگترین جهێ خۆجهبوونا ئێزدیان كو د پەرتووكا شەرەفنامەیێ دا هاتیە، جزیرا بۆتان و موسل و دهۆك و ئامەد و حەلەب و ڕەهایێ و خوێ بوویە، ل ئیرانێ ب میرێن دۆنبەلی بەرنیاس, بەلێ ئەڤ دابەشبوونە هێدی هێدی ل بن فشارا هەوا ڤركرنا نەژدای و فەرمانێن عوسمانی بەرتەنگ بوویە و گوهۆڕین بسەردا هاتن.

## جهێ خۆجهبوونا ئێزدیان

- **باشورێ کوردستانێ:**

١- پارێزگەها موسلێ، ڤان دەڤەران ڤەدگریت (سەنتەرێ باژێرێ موسلێ، قەزا شێخان، شەنگال، زومار، ئەلقوش).

٢- پارێزگەها دهۆکێ، کۆمەلگەها شاریا (سێمێل)، کۆمەلگەها خانکێ و دەڤەرا دێرەبینێ.

- **رۆژئاڤایێ گوردستانێ:**

(قامشلو، عەفرین، دەڤەرا جەراح و گومدێن دەوروبەرێ وێ)

- **باکورێ کوردستانێ:**

ئەڤان دەڤەران ڤەدگریت (مێردین، سێرت، رەها، قارس، ئاگری و ئاردوهان (ل سەر سنورێ ئەرمەنستان).

- **ئەرمەنستان:**

لاگزنین (گوندێن چیایێ ئارارات و دناڤ پایتەختێ یەریڤان دا).

- **گورجستان:**

لەتەبلیسا پایتەخت دژین.

- **دەڤەرێن دیێن جوراجورا:**

ل وەلاتێن (ئەلمانیا و مەجرستانێ و فرەنسا و ئەمریکا دژین).

## پەرتووك و جهێن وان یێن پیرۆز:

١- پەرتووکا جەلوە (بۆ شێخ ئادی موسافیر ڤەدگەڕیت).

٢- مەسحەفا ڕەش.

ژبلی ئەڤان کەسایەتیێن پیرو شیخ و کریف و فەقیر و قەوالێ (قەول و بەیت) و موريد هەنە.

٣- دۆلا لالش، سالانە پەیرەوانێن ئێزیدیاتیێ سەرەدانا وێ دکەن.

لالش پەرستگەها هەرە پیروزا ئێزیدیانە دکەڤیتە دەڤەرەکا چیایی ل قەزا شێخان نێزیك (ئێسڤنێ) ل دووراتیا (٦٠) کلم ل باکورێ ڕۆژئاڤایێ باژێرێ مووسلێ، پەرستگەها لالش و گۆڕێ شێخ ئادی تێدایە، زێدەباری بارەگاییێ جڤاتا ڕۆحانی یا پەیرەوێن ئێزیدیاتیا جاهانی.



## هەلبژاردنەك ژ جەژن و ڕوژیگرتنێ ژلایێ ئێزیدیانڤە :

ڕۆژیگرتنا ئێزیدیان سالأنه پتر ژ جارەکێیه بۆ وان هەیه ب درێژاهیا سالێ ب ڕۆژیبن، بەلێ ئەڤە ژ هەمی کەسان ڤەناگریت، پەیوەندی ب بیروباوەریا وی کەسی ب خۆڤە هەیە. بەلێ ڕۆژیا گشتی ل سەر هەمیان پێدڤییه بگرن، دبێژنێ جەژنا ڕۆژییێ (ئێزی) ئانکو ڕۆژی بۆ خودێ، سێ ڕۆژە و دکەڤیتە هەیڤا کانوونا ئێکێ یا سالا زایینی.

ئێزیدی پەیروێ سالناما ڕۆژهەلاتا کەڤن (ریکۆری) دکەن، دڤان هرسێ ڕۆژان خۆ ژ هەمی خوارن و ڤەخوارنێ و خۆشییێ و دەم بۆراندنێ دپارێزن، ڕۆژا چوارێ دکەنە جەژن بناڤێ جەژنا (ڕۆژییێن ئێزی).



- **جەژنا جەمایێ (عید جما):** ئێکە ژ جەژنێن وان یێن کەڤن و مەزن ئانکو (جەژنا خرڤەبوونێ)، حەفت ڕۆژان بەردەوام دبیت، سرود و ڕێوڕەسمێن خۆییێن ئایینی ئەنجام ددەن، قوربانیان ژی بۆ ددەن.
- **جەژنا سەرێ سالێ:** دگەل جەژنا سەرێ سالا بابلی هەڤتەریب دبیت و دکەڤیتە وەرزێ بهارێ.
- **جەژنا خدرو ئەلیاس:** ئەڤ جەژنە دکەڤیتە پێنج شەمبا سێیێ ژ هەیڤا ڕەشەمەهێ، ئەڤ خدروئەلیاسە د پڕانیا ئایینێن دی دا هەیە، وەك (الخضر) ژلایێ عەرەبانڤە، خواجە خدر ژلایێ هیندییێن موسلمانڤە، ژلای ێمە ب خۆ ژیڤە ب خدرێ زیندی دهێتە نیاسین، کریستیانژی ب گورگیس و دناڤ ئیسرائیلیاژی دا ب (ئارامیا) یان، ئیلیا بەرنیاسە.

ژبلی ئەڤانە چەندین جەژنێن دیژی هەنە.

# هەوێن قرکرنا نەژادی دژی ئێزیدیان



ئێزیدی ب درێژاهیا دیرۆکێ ژبەر هۆکارێن ئایینی و ئابووری ڕووی ب ڕووی (٧٢) حەفتێ و دوو هەوێن ژ ناڤبرنێ بووینە، ترسناکیرین فەتوا کو کوشتنا ئێزیدیان حەلال دکەت فەتوا (ئەحمەد کورێ حەنبل)ە ل سەدێ نەهێ و لیپی سەمەرقەندی و مەسعودی و العمادی و عەبدولاییێ ڕەبتکی (سالا ١١٥٩ ز مریە) بوویە.

فەتوا (أبو سعود العمادی) کو موفتییێ عوسمانی بوو ل سەر دەمێ سولتان سلێمانێ قانوونی و سەلیمێ دووێ، زنجیرەکا فەتوا ب تەکفیرکرنا ئێزیدیان ب دوڤ خۆ هێلایە، ژێدەرێن ئێزیدی ئاشکرا دکەن کو (العمادی) کوشتن و بەندکرن و بازرگانیکرنا کچ و ژن و بنبرکرنا توخمێ ئێزیدیان حەلال کریە.

## فەرمانا ئێزدیان :

فەرمان : ئێزدیان ئەڤ پەیڤە ب هەڤشێوێ ڤرکرنا نەژادی نیاسییە , تورکان ئەڤ پەیڤە بۆ فەرمانێن هەو و هێرشێن سولتانێن عوسمانی بکارئینایە , کول ئەسمانە د دەرچوون دژی ئێزیدیان . ئێزدی ژبەر بەرفرەهیا هێرشێن سەربازی نەشیان بەرهەنگاریا وان ببن ب ناچاری چوونە دەڤەرا چیایێ ومانە ژ شکەفتان , وژبەر هێرش و هەوێن بەردەوام ب درێژاهیا دیرۆکێ وەلێ کرن ژ ژیانا شارستانیەتێ و پێشکەفتنێ دوور بکەڤن , ئو ئەڤان شەرو کارەساتان کارتێکرن ل سەر ژێرخانا شارستانیەتێ و رۆشنبیریا ئێزیدیان کریە .

دەسپێکایا ڤان هەو هێرشان ل سەردەمێ میر (جەعفەرێ داسنی) میرێ ئێزدیان, ئانکو (سەردەمێ خەلیفێ عەباسی موعتەسەم ل سالا (٢٢٤) مشەختی) دەسپیکرن, وبەردەوامبوون هەتا هەردوو سەدەی یین (١٦, ١٧ز) .

هێرشا پاشایێن عوسمانی ئێکەم فەرمانا وان ل سالا (١٥٦٠ز) ی بوو ب فەتوا (أبو السعود العمادی) , هێرشا مێرییێن جەلیل یێن موسلێ بوو بۆ سەر شێخان و چیایێ شنگال ێ پاشی هێرشا والییێن عوسمانی ل بەغدا دەسپێکرن , وەك حسن پاشا (١٧١٥) , أحمد پاشا (١٧٣٣) , سلیمان پاشا (١٧٥٢).

هەر ل ڤێ دەوروبەری هێرشا نادر شاهێ ئیرانی ژی هاتە سەر , ب درێژاهیا سالێن (١٧٣٢-١٧٤٣ز) دبەردوامبوون , ئەڤجا ل پشتی ئەڤان ژی زنجیرەکا هێرشان د دویف دا هات , علی پاشا (١٨٠٢ز) سلێمان پاشایێ بچووك (١٨٠٩ز) ئینجە بەیرەقدار (١٨٣٥ز) , رشید پاشا (١٨٣٦ز) حافز پاشا (١٨٣٧ز) .

محمد شريف پاشا (١٨٤٤-١٨٤٥ز) محمد كريدلى ئوْغلوْ (١٨٤٥-١٨٤٦ز) تەيار پاشا (١٨٤٦-١٨٤٧ز) ئەيەب پاشا بەد (١٨٩١ز) ، فەريق عمر وەهبى پاشا (١٨٩٢ز) و بەكر پاشا (١٨٩٤ز) . هەروەسا هێرشا ميرێ سۆران (پاشايێ مەزن پاشايێ كۆره) بوو دناڤبەرا سالێن (١٨٣٣-١٨٣٤ز) و هيرشا بەدرخان بەد ل سالا (١٨٤٢ز) ز ل دەسپێكا سەدێ بيستێ ل دەمێ كومەلكوژيا ئەرمەنييان ل سەر دەستێ (ئيتحا دوتەرەقى) ل سالا (١٩١٥ز) ئێزيدى ژى ڤەگرتينە، ئەڤ هەمى مال وێرانيە ل سەردەمێ دەولەتا سەلتانێ ئوسمانى دەرهەق بڤێ تەخا ئايينى هاتيە كرن ، ئەرێ دڤێت چ زيانەكا مەزنا گيانى و مادى و كەلتورى و ژينگەهى و مرۆڤايەتى د دوويڤ دا هاتبيت ، هژماركرنا وان زيانان بزحمەتە بهێتە خەملاندن .



## جینۆسایدکرنا ئێزیدیان د دەولەتا عیراقیٚ یا نوودا :



پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقیٚ ، سەد خوزی بدەسدلاتا بەریٚ دبرن . پشتی ماوەکیٚ ێکێم ل سالا (١٩٣٥ز) لەشکەریٚ پاشایەتی یێ عیراقیٚ هێرشەکا بەربەلاڤ کرە سەر دەدڤەرێن ئێزیدی ئاکنجی ، هەمان تاوانێن داگیرکەرێن بەریٚ دوبارە کرنەڤە ، ل سەردەمێ رژێمن ئێك ل دویڤ ئێکێن عیراقیٚ دناڤبەرا سالێن (١٩٦٣-٢٠٠٧ز) ماوەکیٚ کێم ژی خۆشی بژیانا خۆ نەبر، کوشتن ، راگوهاستن ، عەرەب کرن ، بەعسی کرن و کۆمکرنا وان ل ئوردیگاییێن زۆرەملی ببو ژیانا ئاسایی یا ئێزدیان . پشتی هەرفتنا رژێما بەعس و نەمانا دەسەهەلاتاوان ل وان دەڤەران تاقمەکیٚ توندرەو بناڤیٚ ئایینی ، شیان مەیدانا تاوانێن خۆ بەرفرهر بکەن و بگەهنە دەڤەرێن ئێزیدیان . ل رۆژا (١٤-تەباخیٚ-٢٠٠٧) ب رێیا ترومبێلەکا بارهەلگرا بومرێژکری مەزنترین تاوان ل کومەلگەها (القحطانية) تەل عوزێر ئەنجامدا ، قوربانییێن ئەڤیٚ تاوانیٚ گەهشتنە (٨٠٠) کەسان ژ کوشتی وبریندااران ژبلی زیانێن مادی ژماڵ و خانوویێن

هـاولاتـيان دان، دگەل چەندین تاوانێن دەستدرێژیا کوشتن و رەڤاندنێ ب فەتوا توندرەوان .

مەزنترین تاوان ل سەدێ بیست و ئێك ێ ب دەرهەڤا ئێزدیان هاتە ئەنجامدان ، ل خزیرانا (٢٠١٤ز) ێ پشتی کەفتنا موسلێ و باژێر و باژێرکێێن دەوروبەر د دەستێ گروپێن تیرورستێن داعشدا هەروەسا ل هەیڤا تەباخێ یا هەمان سالێ دەڤەرا شنگالێ و باژێرو باژێرکێن ئێزیدیان ژی کەفتنە بەرهێرشا ئەڤێ تاقما درەندە، هژکارەکا زۆرا هاولاتیان هاتنە کوشتن و ئێخسیرکرن ئەوێن دیژی ژ بوو خۆ رزگارکرنێ چوونە چیایێ شنگالێ ، ئەڤ تاوانە هندیا مەزن بوو وەکی ئەنفالا سالا ١٩٨٨ز بسەر مللەتی مەداهاتی بوو .



نەتەوێن ئێکگرتی ئەڤ کارێ داعشان بتاوانا جەنگێ دژی مرۆڤایەتییێ هژمارد ، ئێزیدی روو ب رووی قرکرنا نەژادی بوون ، پتر ژ (٣٠٠٠) سێ هزار کوشتی ژ پیرو ژن و زارۆکان ، و (٥٠٠٠) پێنج هزار ژی هاتنە رەڤاندن ، هەرووەسا نێزیکێ (٤٠٠) چوار سەد هزار کەس ژی ئاوارەی باژێرێن دهۆکێ و زاخۆ و هەولێرێ و سلێمانییێ بوون . بێ کۆ سادەترین پێدڤێن خۆ یێن ژیانێ دگەل خۆببن ، ژبلی ئەڤان پتر ژ (١٥٠٠) هزا و پێنج سەد کچ و ژن رووی ب رووی دستدرێژیا ناموسێ بوون و پتر ژ (٢٠٠٠) کچ و ژن ژی ل بازارێ موسلێ و رەقە یاشامێ کرین و فرۆشتن پێ هاتینەکرن . پشتی ئەڤێ کارەساتا مەزن ئێزدیدیان چەند یەکەیێن بەرگریا چەکداری دامەزراندن هاریکاریا هێزێن پێشمەرگەیێ کوردستانێ ب مەرەما رزگارکرنا دەڤەرێن خۆ ل بن دەستێ توندرەوێن داعشە .



## ژێدەر


١. ئەمیر قادر: دۆزێ جینۆسایدی خەلكێ كوردستان: كونگرێ جیهان ناسان ب جینۆسایدا گەلێ كورد: هەڤلێرن ٢٠٠٨.

٢. پ. ی. د سەعدی ئۆسمان هەروتی: سیاسەتا پاكتاوی ڕەگەزی كورد ل كەركووك ددای ڕاپەرینا: كونگرێ جیهان ناساندنا ب جینۆسایدا گەلێ كورد هەڤلێر، ٢٠٠٨.

٣. د. مارف عومەر گول: جینۆسایدی گەلی كورد: هەڤلێر ٢٠١٠.

٤. دراسة عن الكورد الفيليين http: www.kurdefrin.com/vb/t٧٤١١.html

٥. ڕێكارێ مزویری: شیواز و میكانزمی جینۆسایدە د جینۆسایدی بارزانییەكان: كونگری جیهان ناساندنا ب جینۆسایدا گەلێ كورد هەڤلێر، ٢٠٠٨.

٦. ڕێكارێ مزویری: ئەنفال و كۆم كوژی و كاریگەریێن دەروونی، هەڤلێر ٢٠١١.

٧. ڕێبوار ڕەمەزان عەبدولا: باروڤی لەناوبردنی بارزانییەكان، چاپا ئێكێ ٢٠١٢.

٨. ڕێبوار ڕەمەزان عەبدولا: جینۆسایدكردنی بارزانییەكان ل سەدەی بیستەدا. هەڤلێر، ٢٠١٢.

٩. ڕێكخراوا v.i.d.p ئەلمانیا، وەرگێران ژ ئەلمانی: ناسح ئیبراهیم دزەی: كوردستان گەورەترین هێرش بەچەكی كوشندەی كیمیاوی، دهوك، ٢٠٠٨.

١٠. جاسم محەمەد عەلی: جینۆسایدی دانیشتوانی پارێزگای سلێمانی، كونگرێ جیهان ناساندنا ب جینۆسایدا گەلێ كورد: هەڤلێر، ٢٠٠٨.

١١. خەبات عەبدولا: هەڵەبجە.... مەملەكەتی ژیان، سلێمانی، ٢٠١٠.

١٢. خەلیل عەبدولا: بە جینۆسایدنا سینی ئەنفال، سلێمانی ٢٠١١.

١٣. فریشتەكەوە: كارەساتی هەلەبجە، هەڤلێر، ٢٠٠٨.

١٤. فرمان عبدالرحمن: پاكتاوى رەگەزى كورد لە كوردستانى عێراقدا، سلێمانى، ٢٠٠٦.

١٥. مهاباد قەرەداغى، كارەساتى ئەنفال و كاريگەرييە دەروونييەكانى لە سەر كۆمەڵگەى كورد: كۆنگرێ جيهان ناساندنا ب جينۆسايدا گەلێ كورد: هەولێر، ٢٠٠٨.

١٦. ميدل ئيست ووچ: وەرگێران محەمەد حەمە ساڵح توفيق، جينۆسايد لە عيراقدا سلێمانى، ٢٠٠٤.

١٧. مايكل ليزنێرگك، ئەنفال لە كوردستانى عيراق، وەرگێران كارزان محمد: سلێمانى ٢٠١١.

١٨. يوسف دزەيى: ئەنفال كارەسات دئەنجام و ڕەهەندەكانى: هەولێر، ٢٠٠١.

١٩. المحامي طارق جامباز: ضحايا عمليات الانفال ١٩٨٨ من المسيحيين و الايزديين، اربيل، ٢٠٠٨.

٢٠. خالد المرسومي: واقع الكورد الفيليين بين الاقصاء و القوانين، العدد السادس لمجلة ((تضامن)) أيلول ٢٠٠٨.

٢١. الكورد الفيليون من تفرعات الشعب الكوردى العريق في التاريخ.

http://www.kurdefrin.com/vb/t٧٤١١.html ٢٤. د. احمد راسم النفيس، من هم الكورد الفيليون؟ http://anna baa.org/nbahome/nba٧٢/kurdhtm .

٢٢. اليزابيث كامبل، كورد فيلي، ترجمة: دياري صالح مجيد: http://nihadtuz.foramarabia.com/t٢٤

٢٣. ضياء السورملى: الكورد الفيلية حقائق و مواقف kadhem English.arabic .kurdish

٢٤. سەردار محمد عبدالرحمن، هوشیار محمد امین خوشناو، نەخشەی (بەعەرەبکردن ، ئەنفال، کۆمەڵگەزورە ملێیەکان، کیمیا باران): ئەتلەسی هەرێمی کوردستانا عێراق، عێراق و جیهان، کومپانیا بۆچا پەهەتیێ و کارێ هونەری، هەڤلێر، ٢٠٠٩ - ٢٠١٢.

٢٥. سەردار محمد عبدالرحمن، هوشیار محمد امین خۆشناو، (ئەتلەسی مێژووی بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردستان، کومپانیا تێنوس بۆ چاپەمەنیێ و کارێ هونەری، بەرگێ ئێکێ، هەڤلێر، ٢٠١٢.

٢٦. وەزارەتا کاروبارێن شەهیدان و ئەنفال کریان: پرۆژێ ئەرشیفکردنی جینۆسایدی گەلی کورد، زنجیرە (٦) هەولێر، ٢٠٠٨.

٢٧. عومەر محەمەد: کومەڵکوژی بارزانییەکان بە ئەنفال ناوبەرێن یا بە جینۆساید، گوڤارا ئەنفالستان، ژمارە (٩) Anflistuh@yahho.com، چاپخانا رنج.

